ژمارەی نایاب

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا

# بڕیار

12

ساڵی یەکەم -ئایاری 2009

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی



The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

## پیرۆزبێت ساڵیادی بڕیار

سەرەتایەک لە زانستی ڕێکخستن.

پەلە مەکە!

چۆن گۆڕانکاری لە ژیانتدا دەکەیت؟

خودایە دڵێکی ئارام!

چاوپێکەوتن لەگەڵ خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەردا.

بۆ ژیانێکی ئاسوودە
بۆ جیهانێکی
پڕ لە میهرو
خۆشەویستی
لەم ڕۆژگارە دژوارەدا
بریار هەڵبژێرە!!

بۆ ئایندەیەکی ڕوون
با بریار هەمیشە هاوڕێتان بێت

بۆ ئەوەی دەستت هەبێت لە گۆڕانی کۆمەڵگادا
بۆ ئەوەی ئاراستەی تاکەکانی کۆمەڵگا بکەیت
بەرەو گۆڕان و پێشکەوتن و سەرکەوتن
مانگانە بە گۆڤاری بریار خۆشەویستان و ئازیزانت
بەسەر بکەرەوە!!

**نرخی بەشداری ساڵێک** 12 **ژمارە** 30000 **دینار**

**نرخی بەشداری دوو ساڵ** 24 **ژمارە** 55000 **دینار**

zined in Management and Human Development in Kurdistan

# بریار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی –ساڵی یەکەم – ژمارە 12 - ئایاری 2009

























**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار مەسعود تاهیر رۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەمەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

07705033131

**پەیوەندییەکان**

محەمەد هاشم

بەرزان ئەبوبەکر

**دیزاین**

جەمال دەروێش

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم تەلاری سلێمانی مۆڵ نهۆمی/2

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

3193946

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر- شەقامی گوڵان بەرامبەر دەزگای ئاراس

07504463230 07507658535

0662559165

**تیراژ: ٣٠٠٠ دانە**

چاپخانەی سەردەم

**بۆ پەیوەندیکردن بە بڕیارەوە**

کەرکوک: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ - ٠٧٥٠١١٢٩٤٣٧

دەربەندیخان: ٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨

چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣

چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ رانیە: ٠٧٧٠٢٢٩٣٦٢٨

شەو درێژە درێژی لەبن نایە
کێ شەبەقێ دەخاتە ئەم دەرگایە
کەی ڕۆشنایی دەگاتە ئا ئەم لایە
شەو درێژە درێژی هەرچوار لایە

دیلان



سەرنووسەر

یەکەم

دڵۆپ

# پیرۆز بێت ساڵیادی بڕیار!

ساڵێك لەمەوبەر یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی مرۆیی لە کوردستاندا (بڕیار) لە دایك بوو، بەو بڕیارەش بووین بە خاوەنی گۆڤارێکی کارگێڕی لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا!!

ئەمەش لە خۆیدا ڕووداوێکی گەورەیەو شایەنی ئەوەیە هەموو کوردێکی دڵسۆز شانازی پێوە بکات.

گرنگیدان بە کارگێڕیو دووبارە دارشتنو پتەوکردنی سیستەمی کارگێڕیو گرنگیدان بە داهاتە مرۆییەکانو گەشەپێدان بە تواناکان، ئەمڕۆ لە جیهانی پێشکەوتوودا کاری لەسەر دەکرێتو لە ئەولەویاتی کارو خاڵی سەرەکی پێشکەوتنو پەرەپێدانو وەرچەرخان دادەنرێت. لە کاتێکدا بڕیار بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵ دۆستوخۆشەویستانیدا مۆمی یەکەمین ساڵی تەمەنی دادەگیرسێنێت، دڵخۆشین بەوەی توانیبێتمان لە ماوەی ئەم ساڵەو لە میانەی دوانزە ژمارەی ڕەنگینی بڕیاردا، شتێکی نوێمان خستبێتە سەر زانستو ماریفەتو ڕۆشنبیری لە کوردستانداو خزمەتێکمان پێشکەش بە گەلو نەتەوەکەمان کردبێت. هیوادارین بڕیار فاکتەرێکی گرنگ بووبێت بۆ دووبارە بنیاتنانو نوێکردنەوەی تاکی کوردو ڕێکخستنو پەرەپێدانی کاری دامەزراوەییو عەقلیەتی کارگێڕی.

جارێکی تر جلەوی بڕیاردانی دابێتەوە دەست تاکی کورد، کە مافی ڕەوای خۆیەتی بەو مەرجەی بتوانێت سەرەتا لە خودی خۆیدا پیادەی بکات، دوانزە مانگە بڕیار وەك ژوانێکی هەمیشە بەهار، پۆل پۆل دۆستانو هەوادارانی گۆڕانو ڕۆحی هەمیشە زیندوی ئەم گەلەی لە دەور کۆببێتەوەو بە کردارو گوفتار پەیمانی گۆڕانو پێشکەوتنو هەوڵدان بۆ سەرکەوتن بەرەو لوتکە بە یەکتری دەدەن.

زۆرن ئەو مژدە خۆشانەی لەو ماوەیەدا ئێمەو هەموو خۆشەویستێکی بڕیاری پێ شاگەشکە دەبنو هەناسەیەکی شادمانیش بۆ ئێمەو ئارەقی ماندووبوونمان دەسرێت، چەند دڵخۆشین کاتێك لە خوێنەرێکی بڕیار دەپرسین: لەبڕیارەوە چی فێربوویت؟ دەڵێت: بڕیار فێری کردم ببمە خاوەن بڕیاری خۆم!! دڵخۆشین کاتێك بڕیار بەسەربەخۆیی خۆی، وابکات هەموو خوێنەرێك بڕیار بە گۆڤاری خۆی بزانێت؟!

لە ساڵیادی بڕیاردا دڵخۆشین بە گۆڤارەکەمان، دڵخۆشین بە خۆشەویستیو دڵسۆزی خوێنەرانو ئازیزانمان، وێڕای نارەحەتیو بەربەستی زۆر شادومانین بەوەی هیوا بەخشو شادی بەخش بووین.

سرودێکی پڕ لە هیممەتو بەرخودانو هەوڵدانی هەڵقوڵاوی جەرگەی ئەم وڵاتە شیرینە بووین!!

هاوکات نیگەرانین بەوەی کە پرۆژەیەکی نیشتمانی وەها کە هەموو گەلی کورد لێی سوودمەنددەبنو مایەی پێشکەوتنی گەلو نەتەوەیە، لەبەرئەوەی پاشکۆی هیچ کەسو لایەنێك نییە، هیچ ئاوڕێکی لێ نادرێتەوەو کەس ئامادە نییە بێبەرامبەرو بێ هیچ مەرجێك یارمەتی وەها پرۆژەیەك بدات!!

بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیریی کارگێڕی، گەشەپێدانی مرۆییو هەوڵدان بۆ وەبەرهێنانی داهاتە مرۆییەکانو سوودوەرگرتن لە توانای لاوان، کارو ئەرکی حکومەتە، (بڕیار) شانی داوەتەبەر، بەڵام بەداخەوە لایەنە حکومیە بەرپرسەکان، نەیانتوانی بە پارچە کاغەزێکی پیرۆزباییش دەستخۆشی لە بڕیار بکەن، نەك لەسەریان بکەوێت!!

بەڵام بڕیار خۆی بە بەرپرسیار دەزانێت بەرامبەر بە گەلو نیشتمانو وێڕای هەموو زەحمەتو نارەحەتییەك شەو دەخاتە سەر ڕۆژ بۆ خزمەتی ئەم گەلو وڵاتە شیرینە!

دڵنیاشتان دەکەین کە (بڕیار) تەنها نۆبەرەی پرۆژە مرۆییەکانمانەو بە ویستی خوداو پاشان بە هەوڵو یارمەتی ئێوەی دڵسۆزو کوردپەروەر چەندین پرۆژەی وەبەرهێنانی داهاتی مرۆیی ئەنجام دەدەین...

بەڵێنیشتان دەدەینێ کە بڕیار دەبێت هەر سەربەخۆ بێتو مافی خاوەنێتیی بۆ هەموو کوردێکی دڵسۆزو نیشمانپەروەرە.

ئەرکی سەرشانی هەمووشمانە کە بە هەموو شێوەیەك یارمەتیو هاوکاری بڕیار بکەینو کار بۆ سەرکەوتنو بەرەو پێشچوونی بکەین.

پیرۆزبێت ساڵیادی بڕیار لە هەموو کوردێکی خاوەن بڕیار، ڕێزو خۆشەویستی بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی شەونخونیان کرد بۆ ئەوەی بڕیار لەدایك بێت.




هەمـوو جیهـان ڕێگـە چۆڵ دەکات بۆ ئەو کەسەی دەزانێت بەرەو کوێ هەنگاو دەنێت.

رالف ئەمرسلون

هەرگیز هیممەتت نزم نەبێت، چونکە هیچ هۆکارێکم نەدیوە هێندەی هیممەت نزمی بوبێتە مایەی دواکەوتن و دەستەوەستانبوونی خاوەنەکەی.

عومەری کوڕی خەتاب

چوار ڕێگا هەیە بۆ بە زایەدانی کات: (بەتاڵـی، کەمتەرخەمی، ئەنجامدانی کار بەشـێوەیەکی خراپ، کارکردن لە ناوەختدا).

ڤۆلتێر

ئەگەر دوو فرۆشـت پێ بوو، بە یەکێکیـان کولێرەیەك و بەوی تریان گوڵێ بکڕە.

پەندێکی ژاپۆنی

هـاوار بۆ ئـەو میللەتەی دەخوات لەوەی خۆی نەیچاندووە، دەخواتەوە لەوەی خۆی نەیکردووە بە خۆشـاو، ئەو بەرگە دەپۆشێت کە خۆی نەیچنیوە.

جبران خەلیل جبران

فێڵم لێ بکە لە نرخدا، بەڵام فێڵم لێ مەکە لە کەل وپەلەکەدا.

پەندێکی هیندی

ئەگەر زانیمان چۆن شکسـتمان هێنا، تـێ دەگەین چۆن سـەر دەکەوین.

هەمەنگوای

ژیان هیچ نرخێکی نییە، ئەگەر ئامانجێـك نەبێت لـە پێناویدا خەبات بکەیت.

سوفاج

# کارگێڕی بە چیرۆك

# دەتوانیت لە کاتی ڕەشەبادا بنووی؟!

کشتیارێك زەوییەکی لە کەناری دەریایەك هەبوو، ڕایگەیاند کە پێویستی بە کەسێك هەیە یارمەتی بدات لە چاندنو بەڕێوەبردنی زەوییەکەیدا، بەڵام زۆرینەی خەڵك نەیانتوانی ئەو کارە قبوڵ بکەن لە ترسی ڕەشەبای توندی زەریا، چونکە کاتێك ئەو ڕەشەبایە هەڵی دەکرد زەرەرو زیانو وێرانکارییەکی زۆری دەگەیاندە هەموو ناوچەکانی کەنار!

لە یەکێك لەو ڕۆژانەدا کە کابرای کشتیار چاوەڕانی کەسێکی دەکرد کە وەکو کشتیارێك کاری لا بکات، پیاوێکی کورتە باڵای لاوازی تەمەن مامناوەند هاتە لای بۆ ئەو مەبەستە.

کشتیارەکە پرسیاری لێ کرد: ئایا تۆ جوتیارێکی بە تواناو شارەزای؟

ئەویش لە وەڵامدا گوتی: (دەتوانم بنووم کاتێك کە ڕەشەباو گێژەڵۆکە هەڵدەکات)!

وێڕای سەرسوڕمانو تێ نەگەیشتنی لە وەڵامەکەی، کابرای خاوەن کێڵگەکە ناچار بوو بە دامەزراندنی ئەو پیاوە، چونکە کەسی تری دەست نەکەوت!

پیاوە کورتە باڵاکە بە چوستو چالاکی دەستی بە کارکردن کردو سبەینان پێش خۆرەتاو تا خۆراوابوون بێ وچان کاری دەکرد.

تا لەشەوێکی ئەنگوستەچاودا ڕەشەبایەکی توند هەڵی کرد.

کابرای خاوەن کێڵگەکە بە هەڵەداوانو پەشۆکاوی خۆی گەیاندە لای جوتیارەکە بۆ یارمەتی دانیو هاواری لێکرد: هەڵسە ڕەشەبایەکی توندە، ئێستا هەرچی هەمانە وێرانی دەکات!

خێراکە هەموو شتەکان بپێچەرەوەو مەحکەمیان بکە، پێش ئەوەی ڕەشەبا بیانبات!

جوتیارە بچکۆلەکەش گوتی: بۆچی هەڵسم قوربان، مەگەر پێشتر پێم نەگوتبووی دەتوانم لە کاتی ڕەشەبادا بنووم؟!

کابرای خاوەن زەوی بە جارێ تورە بوو، خەریك بوو یەکسەر کابرا لەسەر کارەکەی دەربکاتو وەدەری نێ، بەڵام خێرا چووە دەرەوە تا ئەوەی بۆی دەکرێت ڕزگاری بکات.

سەرنجیدا هەموو شتێك ڕێكوپێکەو جوان بەسراوەتەوەو هیچ شتێك عەیبی نییە!

خەرمانە قرشەکان بەسراونەتەوەو بە جوانی داپۆشراون، مانگاو مەڕوماڵاتەکان لە گەورەکانی خۆیاندان، پەلەوەرەکان لە کولانەو هێلانەکانی خۆیاندان، هەموو دەرگاو پەنجەرەکان بە مەحکەمی داخراون!!

ڕەشەبا نەیتوانی هیچ شتێك بەرێت!! چونکە هەموو شتەکان بە پەرژینێکی سەلامەت دەورە درابوون، هیچ شتێك پشتگوێ نەخرابوو! ئەو کاتە کابرای کشتیار لەوە تێگەیشت کە مرۆڤ دەتوانێت بنوێت کاتێك ڕەشەبا هەڵ دەکات، مانای چییە!!

لەم چیرۆکەوە چی فێردەبین؟!

* عەباس مەحمود عەققاد دەڵێت: کتێبێك سێ جار بخوێنیتەوە باشترە لەوەی سێ کتێب بخوێنیتەوە، منیش دەڵێم: خۆشەویستانم حەزدەکەم ئەمجارە ئەم چیرۆکە زیاتر لە جارێك بخوێننەوە، بۆ ئەوەی لە هەر جارێکی نوێدا وانەی نوێی لێوە فێر ببینو ئەو شتانەی من بۆی نەچووم ئێوە بە بیرکردنەوەو تێرامانی خۆتان وانەی باشتری لێوە فێر بنو منیشی لێ بەهرەمەند بکەن، جا ئەو وانانەی دەکرێت لەم چیرۆکەوە فێربین بریتین لە:

١- کاتێك بەتەواوی لە ڕووی دەروونیو لاشەییو فیکرییەوە خۆمان ئامادە کردووە، ئیتر باکی هیچ ڕووداوێکی کتوپڕمان نییە!

٢- کاتێك بە دڵی پڕ باوەڕو متمانە بە خۆبوونەوە بەرەو ڕووی ڕۆژگار دەبینەوە، نە نارەحەتیەکان دەمان ترسێنێو نە قەیرانەکانیش کۆڵمان پێ دەدات!

٣- هەموو کەسێك لە ئێمە خۆی دەناسێت، جا ئەگەر کارەکانی بەجوانی ئەنجام دابێت، دڵنیایە لە ئەنجامەکان!

٤- زۆرجار ئێمە گلەیی لە قەیرانو ڕووداوە کتوپڕەکان دەکەین، بەڵام لە ڕاستیدا خۆمان بەرپرسیارین، چونکە خۆمان بۆ ئامادە نەکردبوو!

٥ ژیان هەموو کات شەماڵو بای فێنك نابێتو زۆر جار ڕەشەباو گێژەڵۆکەشی تێدایە، زۆر گرنگە پێش ڕوودانیان ئامادە باشیمان تێدا بێت!

م. هاژە شیروانی
کۆلێژی بەڕێوەبردن و ئابوری - زانکۆی سەلاحەدین

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێكخستن
## Organization

مرۆڤ ناتوانێت بە بێ ڕێكخراوەكان بژێت، ئێمە پێداویستیەكانمان لە ڕێكخراوەكان دەكرینو تیایدا كاردەكەین، ڕۆژانەش كارو مامەڵەمان لەگەڵ زۆرێكیان دەبێت، وەكو شوێنی بازرگانی، كارگەكان، مزگەوت، یاریگا، چێشتخانە، وەزارەت، دامودەزگا حكومیەكانو هی تر، هەر هەموو ئەمانە ڕێكخراونو ناتوانین دەستبەرداریان بین.

لێرەداو لە ڕێگای ئەم گۆڤارە نازیزەوە هەوڵدەدەم كە لەسەر زانستی ڕێكخستن (علم التنظیم) پوختەیەكتان پێشكەش بكەم ئەمەش وەكو پێداویستیەكی ئەمڕۆی زۆرێك لە ڕێكخراو و كۆمپانیاكانی ئەمڕۆی كوردستانە، تاوەكو ئاگاداربن لەو پرەنسیپو تیۆریانەی كە لە سەرتاسەری جیهان چەندان لێكۆڵینەوەی زانستی لەسەر ئەنجام دەدرێت.

ڕێكخستن چییە؟

ئاستەمە لە لای زۆرێك لە ئێمە كە وێنای ڕێكخستن بكەین، ئەمەش بە هۆی ئەوەی كە ڕێكخستن ئەو شتە نەبینراوو دیاری نەكراوەیە، سەرەڕای ئەوەی كە زۆرجار لە شێوەی بەرهەم (منتجات) و خزمەت دەردەكەوێت كە مامەڵەی كڕینو فرۆشتنی پێ دەكرێت، یان زۆرێك لە بەڕێوەبەران بەناوی ڕێكخراوەوە وتوێژ دەدەن، لەبەر گرانیو ئاستەنگی لە بەردەم وێناكردنی ئەم وشەیە هەوڵدەدەین كە بەم شێوەیەی خوارەوە ڕوونی بكەینەوە:-

دەتوانین بڵێین: كە ڕێكخستن (Organization) بریتییە لە شوێن Place،و هەرەم Stracture،و پرۆسە Process ،و ئامراز Tool. هەروەك ئەم وێنەیەی خوارەوە:




١- ڕێكخستن وەك شوێن (مكان / كیان):
ئەو شوێنانەی كە ڕێكخستنیان پێدەگوترێت جۆراو جۆرن وەكو: كارگەكان، كۆمپانیاكان، نووسینگە، سەوزە فرۆش، نەخۆشخانەكان، فێرگەكان، زانكۆكان، مزگەوت، وەزارەت، مەڵبەندەكانی فرۆشتن، یانەكان، بەندیخانەكان، سوپا، بەشەكانی پۆلیسو پاركەكان، هەموو ئەو شوێنانە مرۆڤ كاری تێدا دەكات لە بەردەم ئامێرو پشت نوسینگەكانو كارە دیاریكراوەكانی خۆیان بە گوێرەی سیستەمو بنەمای داڕێژراوی پێش وەختە جێبەجێ دەكەن بۆ گەیشتن بە ئامانجی دیاریكراو.

٢- ڕێكخستن وەك هەرەم / قوچەك ( الهیكل):
هەموو ڕێكخراوێك هەرەمێكی (هیكل) هەیە وەكو پەیكەری مرۆڤ ، كە تیایدا ڕووكاری گشتی ڕێكخراوەكەی تیادا دەستنیشان كراوە،و پەیوەندییە سەرەكیەكانی تیادا ڕوونكراوەتەوە، هەرەمی ڕێكخستن (الهیكل التنظیمي) شوێنی سەرۆكی ڕێكخراوو ئەوانەی كە لە ژێر فەرمانی ئەودا كاردەكەن ڕوونكراوەتەوە (بە واتای زنجیرەی سەرۆكایەتی)، و چوارچێوەی سەرپەرشتی كردن (بە واتای ژمارەی ئەوانەی كە سەرپەرشتی تاك دەكەن، ژمارەی ئاستەكانی ڕێكخستنی هەبوو لە هەرەمی

ڕێکخستن، هەروەك لە شێوەی ژمارە (١) دا هاتووە کە خوێنەری بەڕێز دەتوانێ تێبینی ئەوە بکات کە هەرەمی ڕێکخراوی وێنە کراو گەورەترین دەسەڵات بەدیاردەدات کە بەڕێوەبەری گشتییە،و زنجیرەی سەرۆکایەتی بە واتای هەریەك لە بەڕێوەبەری بەرهەم هێنان‌و بازاڕسازی لە ژێر فەرمانی ئەودا کاردەکەن، لە ژێر فەرمانی بەڕێوەبەری بەرهەم هێنان چوار سەرۆك بەش کاردەکەن (واتا سنووری سەرپەرشتی کردنی چوارە)، سنووری سەرپەرشتی کردنی بەڕێوەبەری بازاڕسازی (دووە) هەروەك لەم هەرەمە بۆمان بەدیاردەکەوێت کە پسپۆڕیەکەی لە بواری بەرهەم هێنان‌و بازاڕسازیەو سێ ئاستی ڕێکخستن لە خۆ دەگرێت: ئاستی بەڕێوەبەری گشتی، ئاستی کارگێڕیەکان،و ئاستی سەرۆك بەشەکان. جگە لەمانە ناتوانین وردەکاری زیاترمان بەرچاو بکەوێت لەسەر قەبارەی دەسەڵاتی هەریەك لەم پۆستە باسکراوانەو سروشتی پەیوەندی‌و ڕێککاری نێوانیان، هەروەها سروشتی ئەو کارانەی کە ئەنجامیان دەدەین‌و سروشتی سیستەمی کارگێڕی بەکارهاتوو، لە هەمان کات سروشت‌و شێوەی ئەو تاکانەی کە لەم ڕێکخستنە کاردەکەن، کەواتە بۆمان دەردەکەوێت کە هەرەمی ڕێکخستن تەنها توانای ڕونکردنەوەو بەدیار خستنی زنجیرەی سەرۆکایەتی،و سنووری




شێوەی ژمارە (١) ڕێکخستن وەك هەرەم

سەرپەرشتی کردن، ژمارەی ئاستەکانی ڕێکخستن.

٢. ڕێکخستن وەك پرۆسە (عملیات):

دەتوانین سەیری ڕێکخستن بکەین وەك پرۆسەو بەجێهێنان بە مەبەستی ڕونکردنەوەی جووڵەی ڕێکخستن، بە واتای ڕێکخستنی کۆمەڵێ کاری بەرفراوان لە پرۆسە وەك:

★ دابەشکردنی ڕێکخراو بۆ یەکەی ڕێکخستن (پێی دەوترێت کارگێڕی‌و بەش‌و هۆبەو لق).

★ دەستنیشانکردنی کارەکان (وەسفکردنی) کە تاکەکان کاری تیادا دەکەن.

★ دەستنیشانکردنی ڕێژەی دەسەڵات‌و بەرپرسیاریەتی هەر پۆستێك.

★ دەستنیشانکردنی ڕێژەی پسپۆڕیەتی (لە فێرکردن‌و ڕاهێنان) بۆ هەر پۆستێك یان کارێك.

★ دەستنیشانکردنی سروشتی پەیوەندی هاوکاری‌و هەماهەنگی.

★ دەستنیشانکردنی شێوازی پەیوەندیکردن لە ڕێگای نووسینگەو ڕاپۆرت‌و لیژنەو کۆبونەوەکان.

★ دەست نیشانکردنی شێوازی پێدانی دەسەڵات‌و فەرمان‌و ڕێنماییەکان‌و ئامۆژگاری‌و ڕاوێژ.

★ دەستنیشانکردنی شێوازی گونجان لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ژینگەی دەرەکی.

★ دەستنیشانکردنی شێوازی گونجان لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ژینگەی ناوخۆیی.

★ دەستنیشانکردنی شێوازی بڕیاردان لە یەکە کارگێڕییەکان‌و لە بارودۆخی جیاوازدا.

★ دەستنیشانکردنی شێوازی پسپۆڕیی (بە واتای دابەشکردن) سەرچاوەکان لەسەر یەکەکانی ڕێکخراو.

٣. ڕێکخستن وەك ئامراز (وسیلە):

بەکارهێنانی ڕێکخستن وەك شوێن‌و هەرەم‌و پرۆسە، یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن لە ڕێکخستن بە دانانی ئەوەی کە ئامرازێکە بۆ هاوەڵانی ڕێکخراو (خاوەنی موڵك‌و پشکدارەکان)و بەڕێوەبەران بەمەستی تێکەڵکردنی سەرچاوەکان بۆ دەرکردنێکی نمونەیی بۆ گەیشتن بە ئامانج.

ڕێکخراو سەرچاوەی مرۆیی‌و دارایی‌و کەرەستەی خاو و دابینکردنی بیناو زانیاری، کە پێویستە هەرهەموویان بەیەکەوە وەك تێکەڵەیەك بە باشترین شێوە بەکاربهێنرێن بۆ گەیشتن بە ئامانجی هاوەڵانی ڕێکخراوو بەڕێوەبەران‌و کارمەندان‌و بەکاربەران‌و حکومەت‌و ژینگەو هەموو لایەنە پەیوەندی دارەکان بە ڕێکخراو، ڕێگای تێکەڵ کردنی ئەم سەرچاوەو لایەنانە ئامرازێکی ڕێکخستنە کە ڕێکخراو بەکاری دەهێنێ، پێی دەوترێت (ڕێکخستن).

ئەمەو سەرەڕای ئەوەی کە ڕێکخستن ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە مەبەستی تر کە یارمەتیدەرە بۆ گەیشتن بە ئامانجی کۆتایی ڕێکخراو، بەنموونە:

★ ڕێکخراوو ڕێکخستن ئامرازن بۆ دابەشکردنی کار لە نێوان کارمەندان بە شێوەیەك کە پەرە بە توانا پسپۆڕیەکانیان بدەن لەم کارەداو لە دوایدا بەرزکردنەوەی توانستیان (کفاءة).

★ ڕێکخراوو ڕێکخستن ئامرازن بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆژیاو کەرەستەی خاو بەشێوەیەکی ئابووری کە ئامانجی ڕێکخراو بپێکێ.

★ ڕێکخراوو ڕێکخستن ئامرازن بۆ تێگەیشتن لە ژینگە سەبارەت بە ڕێکخراوو کۆنترۆڵ کردنی بۆ بەرژەوەندی خۆی.

★ ڕێکخراوو ڕێکخستن ئامرازن بۆ سەپاندنی کۆنترۆڵ بەسەر کارمەندان بە پابەندبوونیان بە کار، فەراهەمکردنی دوارۆژێکی جێگیر لە کار، کە لە کۆتاییدا ڕێکخراو دەگات بەو ئامانجەی کە هەوڵی بۆ دەدات.

سەرچاوە د. احمد ماهر ،٢٠٠٥: التنظیم.



# مەشقكردن هۆكارێك بۆ سەركەوتن

رەمزی شوانی

مرۆڤەكان بەگرنگترین دەرامەت دادەنرێن بۆ دامودەزگا حكومیو دامودەزگا تایبەتیەكان، چونكە بەبێ بوونی مرۆڤ هیچ دامودەزگایەك بەڕێوەناچێتو بەرهەم دەست ناكەوێت، بۆیە بە ڕەگەزێكی بنەڕەتیو سەرچاوەیەكی گرنگ بۆ دروست بوونی بەرهەم دەژمێردرێت، بەتایبەت ئەگەر هاتوو ئەو دەرامەتە مرۆییانە لەگەڵ جۆری كارەكەدا بگونجێ، هەر بۆیە مەشق پێكردنی فەرمانبەرانو كرێكاران بەچالاكیەكی گرنگو بنەڕەتیو هۆكارێك بۆسەركەوتن دەژمێردرێت، هەروەها بەچالاكیەك كەسودی بۆ هەموو لایەك هەیە واتە لە ئەنجامی ئەو مەشق كردنە فەرمانبەرانو كرێكارانو ڕێكخراوو كۆمەڵگە سودی لێدەبینێت.

## مەبەست لە مەشق كردن چیە؟

مەشق كردن بەو كردارە دەژمێردرێت كە هەوڵدەدات بۆ چاكردنو باشتركردنی بەجێهێنانی كارەكانی «ئێستاو داهاتوو» لە ڕێگەی زیادكردنو پەرەپێدانی تواناكانی تاكەوە، بەمەبەستی بەدەست هێنانی ئامانجە دیاریكراوەكان. بێگومان مەشق كردن پێناسە دەكرێت بە كردارێكی گۆرانكاریو بەرەو پێش چوونو گەشەپێدانی ئامانجە دیاری كراوەكانی دامودەزگا حكومیو تایبەتیەكانە لە كاتی ئێستاو داهاتوودا.

پێویستە لەكاتی مەشق پێكردندا كۆمەڵێك هۆكار لەبەر چاو بگیرێت بەمەبەستی سەركەوتنی كرداری مەشق كردنەكە، لەوانە:

١- جیاوازی تاكەكان (فروقات فردیة): پێویستە ئەو كەسانەی كە لە كەمترین كاتدا توانای وەرگرتنی زانیاری نوێو بەرەو پێش چونیان هەیە جیابكرێنەوە لەو كەسانەی توانای وەرگرتنی زانیاری نوێیان قورسە یان توانای وەرگرتنیان خاوە.

٢- پاڵنەر (الدافعیة): پێویستە پاڵنەر هەبێت بۆمەشق پێكەران بەتایبەت ئەو كاتانەی ئەنجامی مەشق كردنەكە سەركەوتن بەدەست دێنێت، دەكرێت ئەو پاداشتو خەڵاتانە مادی بێت یان مەعنەوی واتە پێدانی پارە لەكاتی مەشق كردنەكە یان خەڵات كردن لەكاتی سەركەوتن، یان بەرزكردنەوەی پلە كارگێڕیەكانیان.

٣- بەشداری پێكردنی كاریگەرانە (المشاركة الفعالـة): پێویستە بەشداری پێكردنێكی كاریگەرانە بە بەشداریبوان بكرێت لە كاتی مەشق كردنەكەدا، پارێزگاریكردن لە تواناكانیانو پەرەپێدانی توانانیان.

٤- هەڵبژاردنی ڕاهێنەران (اختیار المدربین): هۆكاریكی تری سەركەوتن ئەوەیە پێویستە ڕاهێنەران خاوەن توانایەكی باشو خاوەن ئەزمونێكی پێشینەی باش بن، دورخستنەوەی ڕاهێنەری بێ توانا بۆ ئەوەی ئەنجامی مەشق كردنەكە باش بێت.

٥- شوێنو كاتی مەشق كردنەكە (مكان وزمان التدریب): پێویستە شوێنی مەشق كردنەكە بگونجێ لەگەڵ شوێنی فەرمانبەراندا نابێت شوێنەكەی زۆر دوربێت لەشوێنی كاركردنەكەیانەوە، باشتر وایە مەشق كردنەكە لەشوێنی كاركردنەكەیان بێت، كاتی مەشق كردنەكەش دەبێت بگونجێ لەگەڵ كاتی مەشقكەرانداو، ماوەی مەشق كردنەكە نابێت زۆر بێ بۆ ئەوەی بێزاری دروست نەبێت لە لایان.

## هونەری کۆبوونەوە
### زنجیرەی دوازدەیەم

# کەش و هەوای کۆبوونەوەکان




کەش‌و هەوای ناو کۆبوونەوەکان جیاوازە لە کۆبوونەوەیەکـــەوە بۆ کۆبوونەوەیەکی تر، ئەویش پەیوەســـتە بە سروشـــتی سەرکردەی ســـەرۆکی کۆبوونەوەو ئەندامان‌و هۆشیاری‌و شێوازی گفتوگۆوە، لێرەشدا ئاماژە بە گرنگترین کەش‌و هەواکانی کۆبوونەوەکە دەکەین:

١- دیکتاتـــۆری: لـــەم کەشـــەدا ســـەرۆکی کۆبوونـــەوە یـــا ئەندامێـــك زاڵـــە بەســـەر ئەندامەکانی تردا.

٢- شـــورەوی: تێیدا ســـەرۆکی کۆبوونەوە پەنا بۆ شوراو راپرسی ئەندامان‌و گوێگرتن لە راو بۆچوونیان دەبات.

٣- برایانە: کەشی برایەتی‌و خۆشەویستی باڵ دەکێشێت بەسەر کۆبوونەوەکەدا، دوور لە دووبەرەکی‌و جیاوازی.

٤- کێبەرکـــێ: ئەندامەکان کێبەرکێ دەکەن لەگەڵ یەکتردا، هەر یەکەیان هەوڵی سەرکەوتن‌و پێشکەوتن بەسەر ئەوی تردا دەدا.

٥- رکابەرایەتی: لەم کەشـــەدا ئەندامەکان رکابەرایەتـــی یەکتری دەکەن لـــە ناو خۆیاندا یا لەگەڵ سەرۆکداو ململانێ‌و دوژمنایەتی لە نێوانیاندا دروست دەبێت.

٦-فەرمـــی: کـــەش‌و هـــەوای رەســـمیەت‌و پرۆتۆکـــۆل ئامێـــز بـــاڵ دەکێشـــێت بەســـەر کۆبوونەوەکـــەدا.

٧- گونجانـــدن (توفیقـــی): هەوڵدەدرێـــت تەوفیق لە نێـــو بیرە جیاوازەکانـــدا بکرێت‌و بە چارەســـەرێکی مامناوەند (الحل الوســـطی) کۆتایی پێ بهێنرێت.

٨- ســـنوردار: تیایدا ســـەرۆك‌و ئەندامان پەیوەســـتن بـــە چەنـــد رێورەســـمێکی دیاریکراوەوەو ناتوانن لێی دەر بچن.

٩- ئـــازاد: تیایـــدا ســـەرۆك‌و ئەندامان بە هیچ رێورەسم‌و رێنماییەکەوە پەیوەست نین‌و کەش‌و هەوا زێتر لە پاشا گەردانییەوە نزیکە.

١٠- رەخنەیی: تیایدا کەش‌وهەوای رەخنە گرتن‌و وروژاندنی پرسیاری تەگەرە هێنەر لە بەرامبەر وەرگرتنی پێشنیارو بۆ چوونەکاندا بەسەر کۆبوونەوەکەدا زاڵە.

١١- ساردو سر: تیایدا ساردوسری‌و تەمەڵی ســـەرۆك‌و ئەندامان‌و بێزاریی‌و وەڕەزبوونیان بەدی دەکرێت.

### سیفەتەکانی سەرۆکەکانی کۆبوونەوە:

زانایانی کارگێڕی‌و پەروەردەو دەروونناسی زۆریان باس لە سیفەتەکانی سەرۆك‌و پێشەوا کردووەو دەتوانین بڵێین: ئەستەمە بتوانرێت هەموو ســـیفەتەکانیان کۆبکەینـــەوەو بڵێین جگە لەم سیفەتانە سیفاتی دی نین:

بەڵام لەگەڵ ئەوەشـــدا کۆمەڵێك ســـیفات هـــەن کـــە پێویســـتە ســـەرۆکی کۆبوونـــەوە تیایـــدا هەبێـــت، بـــۆ ئـــەوەی ســـەرۆکێکی کاریگەرو ســـەرکەوتوو بێت، لە گرنکترین ئەو سیفاتەنەش:

١- ســـیفەتە فەسیۆلۆجیەکان: وەکو توانای قســـەکردن بە دەنگێکی بیستراو، زمان پاراوی، توانای دانیشتن بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ.

٢- سیفەتە زانستییەکان: وەکو شارەزایی لە بارەی ئـــەو بابەتانەوە کە باس دەکرێت، توانای وەرگرتن‌و تێگەیشتنی ئەو خاڵە سەرەکیانەی کە لە کۆبوونەوەکەدا باس دەکرێن، توانای گوزارش، قسەکردنی بەتام‌و چێژ‌و سەرنج راکێش، توانای شیکردنەوەو دەرهێنانی ئەنجامەکان.

٣- ســـیفەتە ســـەرکردەییەکان: وەکو رای دروست، زیرەکی، حەماسەت، سەرنج راکێش، جیددی، هاوسەنگ، چالاك، دامەزراو، هێمنی، رێکوپێکـــی، ئـــاکار جوانی، خاوەنـــی وەڵامی ئامادە، توانای دەست پێشخەریی.

٤- سیفەتی ئاکارییەکان: وەکو هۆشیاری‌و وریایـــی تـــەواو، جـــوان رەفتار کـــردن لەگەڵ کەســـانی تردا، توانای خـــۆ گونجاندن لەگەڵ واقیعدا، ئازایەتی لە بەرەنگاربوونەوەی هەڵەو مەترسیەکاندا، ئارەزووی زانیاری کۆکردنەوە، گرنگیدان بە کەسانی دی، درککردنی بەردەوام بە مـــەوادی گونجانی ئاکارو مامەڵەی لە کاتی چالاکیەکاندا.

٥- ســـیفەتە هونەریـــی‌و شـــارەزاییەکان: وەکو ئەوەی هونـــەری خوێندنەوە، گوێگرتن، نووســـین، وتاربێـــژی، هەســـتی رۆژنامەوانی، هەستی هونەری هەبێت.

٦- سیفەتە کۆمەڵایەتیەکان: وەکو ئەوەی کە پەیوەندی بـــاش بێت لەگەڵ گروپەکەیداو توانـــای راکێشـــانی ئەوانـــی هەبێـــت بە لای خۆیدا.

ســـەرچاوە: ١- من إدارة الاجتماعات/ علی حمادی

٢- إدارة النـــدوات والمؤتمرات – محمد أمین عشوش. لە رێگای سەرچاوەی یەکەمەوە.

# کارامەیی پرۆسەی بەدواداچوون

٢/٢

سکرتاریەت

زنجیرەی دەیەم

ئا/ عومەر عەبدولقادر

### دیاریکردنی ئەو بابەتانەی کە پێویستیان بە بەدواداچوونە:

لەبەر گرنگی پرۆسەی بەدواداچوون پێویستە لەسەرت سور بیت لەسەر پەیوەست بوونت بە دیاریکردنی ئەو بابەتانەی کە پێویستیان بە بەدواداچوونەو هەڵبژاردنی باشترین شێوازو کاتی گونجاو بۆ بەدواداچوونەکە، بۆ ئەوەی بارودۆخی کەسەکان لە هەڵوێستی بێزارکەر دوور بخەیتەوە کە بەرەو وەڕەس بوون و بێتاقەتیان دەبات و گیانی هاوکاری و پێکەوە کارکردنیان لاواز دەکات.

شێوازی یادخستنەوەی کەسێك کە مەترسی ئەنجامی دواخستنی کارەکەی لە کاتی خۆیدا لێ دەکرێت، بەشێوازێکی باش دادەنرێت بە تایبەت ئەگەر سور بێت لەسەر ئەوەی کە کاتی تەواوی هەیە بۆ دوورخستنەوەی کارەکەی لە هەر بەربەست و کەم و کورییەك، لەم کاتەدا تۆش ئامادەیی هاوکاری کردنی خۆتی بۆ دەر ببڕە ئەگەر پێویستی پێت بوو.

زۆربەی پرۆفەکاران دۆسیەیەك بۆ پرۆسەی بە دواداچوون بەکاردەهێنن ئەو بابەتانەی تێدایە کە دەخوازێت بەدواداچوونیان بۆ بکرێت بە دوورکەوتنەوە بە پشت بەستن بە یادەوەری.

هەروەك زانیاری تەواوی تێدایە دەربارەی بابەتەکە تاوەکو چی زانیاری پێویست هەیە لە بەر دەستدا بێت بەبێ ئەوەی پێویست بە گەڕان بکات بە دۆسیەکانی تردا.

دەکرێت ئەو دابەشکارییەی دادێ بەکار بهێنین بۆ دیاریکردنی ئەو بابەتانەی کە پێویستە بە دواداچوونیان بۆ بکرێت، لەگەڵ جەخت کردنەوە لەوەی کە بنچینەیەکی جێگیر نییە بۆ دیاریکردنی ئەو بابەتانە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕ بوونی کات و پرۆفەکردنی بەردەوامدا دەبێت سکرتێر شارەزاییەکانی بە توانا پەیدا بکات لە دیاریکردنی رادەی پێویستبوونی هەر بابەتێك بە بەدواداچوون بە پشت بەستن بە بارودۆخ و رەوشی دامەزراوەکان.

یەکەم: ئەو بابەتانەن کە بەڕێوەبەر فەرمان بە بەدواداچوونیان دەکات، ئەگەر بەڕێوەبەر داوای بە دواداچوونی چەند بابەتێکی دیاریکراوی لێکردیت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم بابەتانە تایبەتمەندی خۆیان هەیە، پاشان گرنگە بزانیت ماوەی کاتی پێویست بۆ کاتی هێنانی بەدواداچوونەکە چەندە؟

دەکرێت ئەو کاتە بزانرێت و دیاری بکرێت بە گەڕانەوە بۆ لای ئەوانەی کە هەڵدەستن بە کارکردن لەسەر ئەو بابەتانەو پرسیارکردن لێیان دەربارەی ماوەی کاتی پێویست بۆ تەواوکردنی کارەکە، پاشان زانیارییە بە دەست هاتووەکان بۆ بەرنامەی بە دوادچوونەکە زیاد بکرێت دوای ئەوەی بەڕێوەبەر ماوەی کاتە پێشبینی کراوەکەی بۆ ئەنجامدانی بە دواداچوونەکە پەسەند کرد.

دووەم: ئەو بابەتانەن کە پێویستە لە چەند کاتێکی دیاریکراودا پێشکەش بە بەڕێوەبەر بکرێن:

لە هەر دامەزراوەیەکدا هەندێ بابەت هەن کە زۆر جارو لە چەند کاتێکی دیاریکراودا پێشکەش بە بەڕێوەبەر بکرێن، لێرەدا زیاتر مەبەست لە راپۆرتەکانە، پێویستە ئەم بابەتانە دەست نیشان بکرێن و بزانرێت لە چ کاتێکدا پێشکەش بە بەڕێوەبەر دەکرێن، هەروەها کار بکرێت بۆبەدوادچوونی ئەو کەسانەی پێی هەڵدەستن بۆ دڵنیا بوون لە گەیشتنی بابەتەکان بە بەڕێوەبەر لە کاتی خۆیدا، ئامادەکردن و پێشکەشکردنی راپۆرتی فرۆشراوەکانی هەفتە، نموونەی ئەم جۆرە بابەتانەیە.

سێیەم: ئەو بابەتانەی کە پێویستە لە چەند کاتێکی دیاریکراودا لەلایەن بەڕێوەبەرەوە دەربچن یاخود بنێردرێن:

هەندێ بابەت هەن لەبەشە کارگێڕییەکانەوە بە رێك وپێکی دەردەچن و دواتر لە تۆماری بە دواداچوونەکەدا ریزبەند دەکرێن و بە ماوەیەکی تەواو پێش کاتی خۆی بەڕێوەبەریان لێ ئاگاداردەکرێتەوە، وەك: ناردنی پیرۆزبایی بۆ کڕیارە هەمیشەییەکان، بە بۆنەی جەژنەوە یاخود بە بۆنەی کردنەوەی لقێکی نوێی بازارسازییەوە، یاخود لە کاتی پرسەی هەر فەرمانبەرێك یان کڕیارێکی هەمیشەیی کۆمپانیا، پێوستە پرسە نامەی بەڕێوەبەر ئاراستەی پرسەکە بکات، یان یەکێك لە فەرمانبەران داوایەکی لە بەڕێوەبەر هەیە جا بەهۆی دواکەوتنی مووچەکەی یان بە هەڵە ژماردنیەوە بێت، هەموو ئەم بابەتانەو هەر حاڵەتێکی تر لەم جۆرە بابەتانە دەبێت لە بەرنامەی بەدواداچووندا تۆمار بکرێن و لە کاتی خۆیدا بەڕێوەبەری لێ ئاگادار بکرێتەوە، بەزووترین کاتیش داخوازییەکانیان جێبەجێ بکرێن و وەڵامی پێویستیان بدرێتەوە.

### چەند رێوشوێن و رێنماییەك:

١- دۆسیەیەك ئامادە بکە کە رونووسی (نسخە)ی هەریەکە لە نێردراوەکان، بریار، راسپاردە، داواکارییە نوسراوەکانی بەڕێوەبەری

تێدا پارێزراو بێت کە پێویستە بە دواد چوونیان بۆ بکەیت، باشتر وایە ئەم دۆسیەیە بەردەوام لە نزیك خۆتەوە دابنرێت.

٢- هەر بەڵگە نامەیەك کاتی دەست پێکردنی بەدواداچوونو بیرخستنەوەو جێبەجێکردنی لەسەر بنوسرێتو لە کاتی خۆیدا بەبێ دواکەوتن پیشانی بەڕێوەبەر بدرێت، بۆ ئەوەی بەڕێوەبەر زوو بڕیاری لەسەر بداتو لە کاتی دیاریکراودا جێبەجێ بکرێت.

٣- خشتەیەك دابنێ کە هەموو راسپاردەو داواکارییە نوسراو زارەکیەکانی بەڕێوەبەری تێدا بنوسرێت، بۆ ئەوەی ئامادە بکرێن بۆ بەدواداچوون بەشێوەیەکی نوسراو رێکوپێك، تاکو شیاوی لە بیرچوونەوە نەبن.

٤- هەموو ئەو بەروارو پابەندییە گرنگانە بۆ خشتەکە زیاد بکە کە پێویستیان بە بەدواداچوون هەیەو دەبێت لە داهاتوودا بە بیر بەڕێوەبەر بهێنرێتەوە، هەروەها دەکرێت هەندێ پابەندی تایبەتی بۆ بەڕێوەبەر زیاد بکرێت، وەك پێدانی چەند لیستێکی دیاریکراو، نوێ کردنەوەی بەڵگە نامەکان، نواندنی دڵسۆزی لە ئەرکەکانی تریدا.

٥- رۆژانە لە سەرەتای دەست پێکردنی کاتژمێرەکانی کارکردندا خۆت دۆسیەکان بکەرەوەو پێیاندا بچۆرەوە.

٦- هەوڵبدە سود وەربگریت لە تەکنیکەکانی کۆمپیوتەرو ئامرازەکانی گەرانو رۆژمێری ئەلکترۆنیو ئاسایی بۆ یاد خستنەوەی بەردەوام، تەنها پشت بە یادەوەریت مەبەستە.

٧- دڵنیابە لەوەی کە بە رۆژێك یان دوو رۆژ بەلایەنی کەمەوە پێش هاتنی بەرواری دیاریکراوی هەر بەدواداچونێك بەشە کارگێرییە دەست نیشانکراوەکان یاخود بەڕێوەبەری لێ ئاگادار بکەیتەوە.

٨- دەبێت ئاگادار کردنەوەی بەشە کارگێرییەکان یان لایەنە دەستنیشان کراوەکان پێش هاتنی بەرواری دیاریکراو زارەکی بێت، بەڵام دوای بەروارەکە دەبێت بەدواداچوونەکە بەشێوەیەکی نوسراو و بەڵگە نامەی باوەر پێکراو بێت.

٩- ئاگادار بە هەر کارێك لە بیر بکەیتو بەدواداچوونی بۆ نەکەیت بە جۆرێك لە جۆرەکانی مەترسی بۆ سەر خۆتو بەڕێوەبەرو دامەزراوەکەشت دروست دەکەیت.

١٠- لە کۆتاییدا: لە میانەی پرۆسەی بە دواداچووندا، زیرەکیو ژیریو لێهاتوویيو تەکنیکە هونەرییە کارگێرییەکانت بە کار بهێنە.

# بڕیاری درووست = سەرکەوتن



**فەرەیدون محەمەد**

ئاسوودەییو بەختەوەری لە ژیان هیواو ئامانجی هەموو تاكو خێزانو کۆمەڵگەیەکە، دیارە ئەمەش بە سانایی بە دەست نایەت، بەڵکو بیری وردو زەمینە سازیو نەخشەی گرنگی پێویستە، کاریگەریو رواڵەتی ئەم هۆکارانەش بە باشی دەبینیتەوە لە هەڵسوکەوتو مامەڵەی کەسایەتیە سەرکەوتووەکان، چونکە زۆر جار لە ژیانماندا بەرەو رووی کاروباری وا دەبینەوە کە پێویستی بە بڕیاردانی بە پەلەو تەندروستە لەو ساتوکاتەدا، کە رەنگە ئەنجامی ئەمەش ئاسوودەییو بەختەوەریو سەرکەوتن بێت، بە پێچەوانەشەوە ئەو کە سانەی ناتوانن کاتو ساتە گونجاوەکان بقۆزنەوە بۆ بڕیاردانی دروستو گونجاو تیایدا بەهۆی راڕاییو دودڵیو ترسانەوە، کەمتر ئاسوودەییو سەرکەوتن دەبێتە میوانیانو هەمیشە لە حەسرەتو پەشیمانیدا دەژین، لەبەر ئەوە لە دەست نەدانی کاتو بە هەند سەیرکردنیو وەرگرتنی بڕیاری دروست تیایدا دەبێتە هۆی سەرکەوتن، هەر وەك ئەو بازرگانە سەرکەوتووەی کە خەڵکی وڵاتی یابان بوو، سەرنجی زۆربەی خەڵکی بەلای خۆیدا راکێشابوو، رۆژنامە نووسانیش حەزیان دەکرد لێی نزیك ببنەوەو گفتوگۆی لەگەڵ بکەن، بەڵام ئەو حەزی لەوە نەبوو، تاکو رۆژێك رۆژنامە نووسێك خۆی بۆ ئامادەکردو کاتی گونجاوی بۆ گفتوگۆ دیاری کرد لە گەڵیدا....

رۆژنامە نووسەکە بیری لەوە دەکردەوە چۆن بتوانێت بابەتەکە بوروژێنێتو خوێنەرانی خۆی رازی بکات، بۆیە بڕیاری دا ئەو پرسیارانەی لێ نەکات کە وەڵامەکانیان تەنها یەك وشەیە، بەم شێوەیە کەوتنە گفتوگۆ کردن:

رۆژنامە نووس: نهێنی سەرکەوتنی تۆ لە چیدایە؟

بازرگان: بڕیاری گونجاو لە کاتو شوێنی شیاو.

رۆژنامەنووس: چۆن وات لێهات لە کاتو شوێنی شیاودا بڕیار بدەیت؟

بازرگان: شارەزایی.

رۆژنامەنووس: چۆن شارەزا بوویت؟

بازرگان: بەهۆی بڕیاری نەگونجاو لە کاتو شوێنی نەشیاو.



# بەڕێوەبردن زانستە یا هونەر؟

وەهاب حەسیب محەمەد
کۆلێژی بازرگانی

ئەگەرپرسیارمان لێبکرێت، یان یەکێک بپرسێت گرنگترین داهێنانەکانی سەدەی رابردوو چی بوو؟ یان کام لەمانە بوو: ئۆتۆمبێل، فڕۆکە، یاخود هۆکارەکانی گەیاندن کەجیهانیان پێکەوە گرێداوەو بچوککردۆتەوە بەئەندازەی گوندێک. یاخود دەرمانی کوتان کەبەهۆیەوە ژمارەی دانیشتوانی سەرزەمین چەند بەرابەر زیادی کردووە لە وەڵامدا دەگوترێت:

هەریەک لەم داهێنراوانە بەشێوەیەک کاریگەری لەسەرشێوازو گۆڕینی ژیانمان بەجێهێشتووە، بەڵام هەموو ئەم داهێنراوانە نەیان دەتوانی بەردەوامبن و گەشەبکەن بەبێ داهێنراوێکی تر ئەویش زانستی کارگێڕییە.

کەواتە کارگێڕی چییە؟ زانستە یان هونەرە یاخود هەردوکیانە؟

١- زانست و هونەرە: پەیوەستن بەتێکەڵاوبونی هزرو ژیری لەنێوان رابەرێک و کۆمەڵێک خەڵک، یان کۆمەڵێک پێشەوایەک ئاراستەیان دەکات و سەرپەرشتیاریانە بەمەبەستی ئامانجێکی خوازراو.

٢- کۆمەڵە چالاکیەکی تایبەتە بە سەرکردایەتی بریتییە لە: نەخشەکێشان و رێکخستن، ئاراستەکردن و پەرەپێدانی توانای کارمەندان و چاودێریی بەڕێوەبردنی کارو هەڵسوکەوتی لایەنە سەرەکیەکانی پرۆژەکە لە: (کارمەندان، ئامێر (ئالات)، ئامراز، سەرمایەو بازار بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە دیاریکراوەکانی پرۆژەکە بەباشترین رێگاو کەمترین تێچون. (أحسن طرق وأقل كلفة).

٣- تێکۆشانێکی عەقڵ و ژیرییە، لە لایەن چەند کەسێکەوە ئامانجی بەکارهێنانی ئەوسەرچاوە مرۆیی (الموارد البشرية)و مادیانەی بەردەستە (المواد المتاحة)، مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دامەزراوەکەیە، بەشێوازێکی زانستی و ئەوەندەی لە توانادا بێت .

٤- وەزیفەی تەواوکردنی کارەکانە لەرێگەی کەسانی ترەوە.

٥- هونەری ئاراستەکردنی چالاکیە مرۆییەکانە.

٦- کۆمەڵە خەڵکێکن پێکەوە کاردەکەن بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجێکی هاوبەش.

٧- قۆناغەکانی بریاردان و چاودێرییە بەسەرکارەکانی هێزی مرۆییەوە، بەمەبەستی ئەو ئامانجانەی پێشتردەستنیشان کراون، ئەم دەستەواژەیە جێبەجێدەکرێت بەسەر دوو کەس یان زیاترەوە کە تواناکانیان کۆ کردۆتەوە بەمەبەستی بەجێهێنانی کارێک.

٨- پیتەردراکر ئاوا پێناسەی بەڕێوەبردن دەکات: ئەندامێکی ئابورییە لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا.

جۆرەکانی بەڕێوەبردن :

بەشێوەیەکی گشتی بەڕێوەبردن دابەش دەبێت بە:

١- بەڕێوبردن، سەرپەرشتیاری کار (إدارة الأعمال):

تایبەتە بەسەرپەرشتیاری پرۆژە ئابورییەکان یان ئەو پرۆژانەی کە ئامانجیان بەدەستخستنی قازانجە. ئەو پرۆژانە پرۆژەی تاکە کەسی بێت یان کۆمپانیای یەکگرتوو یاخود کۆمپانیای پشکدار (الشركات المساهمة) کە کەرتی تایبەت یان کەرتی گشتی یاخود کەرتی کار خاوەنداریەتی دەکات، بەمەبەستی بەرهەمهێنانی شمەک و خزمەتگوزاری و پیشاندانیان لەبازاردا، بەهیوای فرۆشتنیان بەو کەسانەی ئارەزوی هەڵبژاردنی ئەو شمەک وخزمەتگوزاریانە دەکەن.

٢- بەڕێوبردنی گشتی (الإدارة العامة):

بەڕێوەبردنی گشتی: تایبەتە بەپرۆژە گشتییەکان کە شێوەی وەزارەت، دەزگای ناوەندی (الجهاز المركزي)، رێکخراوی تەندروستی و فێرکاری جیاواز یان دەستەو کۆمەڵ لەخۆ دەگرێت، وەجیا لەمانە رێکخراوەحکومیەکان شمەک وخزمەتگوزاری پێشکەش بەخەڵک دەکەن بە بەرابەر بێت یان بەخۆرایی، بەهۆی کۆمەڵێ خەڵکەوە کە لە دەزگای بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا کاردەکەن، بەڕێوەبەرەکان هەڵدەستن بە بەڕێوەبردنی رێکخراوە حکومیەکان بەمەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەگشتیەکانی دەوڵەت.

بەڕێوەبردنی گشتی بریتییە لە:

١- هونەرو زانستی کارگێڕییە جێبەجێدەکرێت لەبواری کاروباری فەرمی دەوڵەتدا.

٢- کرداری رێکخستن و بەڕێوەبردنی کارمەندان و کاڵایە، (المواد) بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکانی حکومەت.

تایبەتمەندییەکانی بەڕێوەبردنی گشتی بریتین لە:

١- ئامانجی پێشکەکردنی خزمەتگوزاری گشتییە نەک بەدیهێنانی قازانج.

٢- بەڕێوەبردنی گشتی کاردەکات بۆ بەدیهێنانی یەکسانی لە نێوان هاوڵاتیاندا، لە گەیاندنی ئەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەشیان دەکات.

٣- کارمەند بەشێوەیەکی گشتی زیاتر هەست بەدڵنیایی دەکات (لەجێگیری وەرگرتنی موچەو مانەوە لەشوێنی کاردا)، بەپێوانە بەکەرتی تایبەت.

گرنگترین ئامانجەکانی بەڕێوەبردن بریتین لە:

١- پاشەکەوتکردنی کات و کۆششکردن (الجهد) لە تەواوکردنی کاردا.

٢- رێکخستنی کێشە یاخود ئەرک (لەنێو رێکخراوەکەدا)، کەمکردنەوەی بەفیڕۆدانی (کات و سەرمایەی رێکخراوەکە، یان دامەزراوەکە)، دەست پێوەگرتن لە بەکارهێنانی کاڵادا.

٣- بەدەستهێنانی گەشەسەندنی هاوسەنگ (التنمية المتوازنة)و دابینکردنی خۆشگوزەرانی گشتی.

٤- گونجاندن و هاوکاریکردنی تواناکان و رێکخستنیان بە مەبەستی بەدیهێنانی ئامانجەکان.

لە کۆتایدا دەتوانین بڵێین: ئەوانەی قسەیان لەسەر بەڕێوەبردن کردووە هەندێکیان بە: زانست ناوزەدی دەکەن، برێک پێیان وایە هونەرە، کۆمەڵێکیش دەبێژن هەردووکیانە (زانست و هونەرە لەیەک کاتدا)، ئەوەی ماوە بڵێین لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا زیاتر پەیرەوی لایەنە زانستییەکەی دەکرێت.

بەڵام لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا (دواکەوتووەکاندا) هونەرە زیاتر تازانست بێت. لەگەڵ ئەوەشدا خەڵک وا راهاتون بەڕێوەبردن بریتی بێت لەوبینایەی یان ئەو بەشەی، بەڕێوەبەر، یان هاوکارەکانی یاخود لیژنەی بەڕێوەبردن لە (رێکخراو یان دامەزراوەدا) کاری تیادا دەکەن.

# بەرپرسیاریەتییە بەردەوامەکانی بەڕێوەبەری قوتابخانە/ ٢

**بەرپرسیارییەتی هەفتانەی بەڕێوەبەر:**

١- کۆبوونەوەی لەگەڵ دەستەی کارگێڕی کۆتایی هەموو هەفتەیەك: بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر هەندێ کاروباری پەیوەست بە قوتابخانە.

٢- بەدواداچوونی کارەکانی یاریدەدەری قوتابخانە.

٣- بەدواداچوونی کارەکانی رابەری قوتابیان.

٤- بەدواداچوونی کارەکانی پێشەنگی قوتابی.

٥- بەدواداچوونی کارەکانی لیژنە گشتییەکان.

٦- بەدواداچوونی بەشە چالاکیو دڵنیابوون لە ئاستی چالاکی.

٧- بەدواداچوونی ئەو سەردانانەی کە لە نێوان مامۆستایاندا دەکرێت.

**بەرپرسیارییەتی مانگانەی بەڕێوەبەر:**

١- ژماردنی دواکەوتنو نەهاتنی مامۆستایانی قوتابخانەو بەرزکردنەوەی بۆ بەشی پسپۆڕ لە بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو فێرکردن.

٢- تەماشاکردنی هەموو تۆمارەکانی رێکخراو بۆ رۆیشتنی کارو واژۆکردن لەسەری.

٣- بەدواداچوونی فایلەکانی قوتابیانی گواستراوەو هاتوو بۆ قوتابخانە، هەروەها دڵنیابوون لە ناردنو وەرگرتنی هەموو فایلەکان.

٤- بەدواداچوونی تۆماری بەدواداچوونو سەرژمێری بەردەوامو واژۆکردن لەسەری.

٥- بەدواداچونی پرۆشۆری مانگانە کە قوتابخانە دەریدەکات.

**بەرپرسیارییەتی وەرزی بەڕێوەبەر:**

(پێش کۆتایی هەموو وەرزێکی خوێندن):

١- ئامادەکردنی رێوشوێنی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی وەرزی خوێندن.

٢- کۆبوونەوە لەگەڵ مامۆستایان بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کارەکانی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی وەرزی خوێندن.

٣- وەرگرتنی پرسیارەکانی وەرزی خوێندن: (وەرزی یەکەم – وەرزی دووەم - بۆ هەردوو خول).

٤- وەرگرتنی دۆزینەوەی کارەکانی ساڵێك پێش چاودێریکردن.

٥- خۆ ئامادەکردن بۆ ئاهەنگی کۆتایی قوتابخانە.

٦- دروستکردنی لیژنەی تایبەت بە ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانو چاودێری نمرەکانو دەرهێنانی ئەنجامەکان، هەروەها راسپاردنیان بە شێوەیەکی فەرمی.

٧- دەرهێنانی ئەنجامەکانی قوتابیانو پشت بەستن بە ئەنجامەکەی.

٨- پشکنینی ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکانو روونکردنەوەی لایەنە پۆزەتیڤو نێگەتیڤەکانی.

٩- ئامادەکردنی راپۆرتی کۆتایی وەرزو بەرزکردنەوەی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو فێرکردن.

١٠- توێژینەوە لەسەر ئەو بەربەستانەی کە رووبەرووی بەڕێوەبەری قوتابخانە بۆتەوە لە میانەی وەرزی خوێندنو دانانی چارەسەر بۆیان.

**بەرپرسیارییەتی ساڵانەی بەڕێوەبەر:**

**لە سەرەتای ساڵ:**

١- وەرگرتنی کارەکانو بەرپرسیارییەتیو ئەرکەکان بۆ ساڵێکی تەواو بۆ هەریەك لە: (یاریدەدەر- رابەر- مامۆستا- کارگێڕی پەرتووکخانە- نووسەر- بەکارهێنەر- پاسەوان)و راسپاردنیان بە شێوەیەکی فەرمی.

٢- نوێکردنەوەی زانیاریەکان لە تۆماری باری فەرمانبەران.

٣- تۆمارکردنی ناوی قوتابیان لە تۆماری زنجیرە.

٤- پڕکردنەوەی دەفتەری ئامارو ناردنی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو فێرکردن.

**لە کۆتایی ساڵ:**

١- کەسە یەکەمەکان لە مامۆستایانو قوتابیان.

٢- ئامادەکردنی راپۆرتێك لە بارەی خەملاندنی فرۆشگای قوتابخانە (پارەی هاتووو خەرجییەکان).

٣- ئامادەکردنی راپۆرتی ساڵانە بۆ کارگێڕی قوتابخانەو بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو فێرکردن.

٤- بەدواداچوونی ئامادەکردنی راپۆرتی ساڵانە بۆ رابەری قوتابی لە قوتابخانەو ناردنی بۆ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەوفێرکردن.

٥- دابەشکردنی ماوەی دەوام لە کاتی پشووی هاوینە لە نێوان فەرمانبەرە کارگێرییەکانی قوتابخانە: (یاریدەدەر- نووسەر- ئامادەکاری تاقیگە)، ئاگادارکردنەوەی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەو فێرکردن پێیان.

# کێشە و بڕیار

م. ڕێباز

وەك بایەخدانێکی زیاتر بە واقیعی ئەمڕۆی بواری کارگێڕیو بازارسازی (بڕیار) لە دووتوێی گۆشەیەکی نوێدا «کێشەو بڕیار» هەڵدەستێت بە خستنە رووی کێشەیەکی وەهمی لەهەر ژمارەیەکداو هەوڵدەدات چارەسەری نموونەیی بۆ ئەو کێشەیە دیاری بکات، بۆ ئەوەی دواتر خاوەنی کێشەکە بڕیاری سەرکەوتووی خۆی بدات.

بۆ زیاتر ئاشنابوونی هەمووانو سوود وەرگرتن لە بۆچوونو رای جیاوازی یەکتری، بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی سەرکەوتوو دەرگای «کێشەو بڕیار» کراوەیە بۆ هەر چارەسەرێك کە تۆی خوێنەر بە پەسەندو شیاوتری دەزانیت.

کۆمپانیای (تەتەر) بۆ ئاڵوگۆڕو حەواڵەی دراو، لە سلێمانییە، سەرەتای کاری ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٩٢) لە سەرەتاوە کارییان گۆڕینی دراوەکان بوو، لە دوای ساڵی (١٩٩٨)ەوە بە رووی دنیای حەواڵەدا کرانەوە.

لینکی حەواڵەیان بۆ ئێران لە رێی حیساب بانکێکی خزمێکی خۆیان بووە کە خەڵکی کوردستانی رۆژهەڵاتە،و لینکی حەواڵەیان بۆ تورکیا نوسینگەیەکی هاوپیشەیان بووە لە زاخۆ.

بەهۆی ئەوەی (١٠) ساڵ زیاترە لە بواری حەواڵەدا کاردەکەن توانیویانە تۆڕێکی باش لە مشتەری دروست بکەنو خەڵکانێکی باش کۆبکەنەوەو ببنە جێی متمانەیان بۆ حەواڵەکردنی پارەکانیان بۆ دەرەوەی وڵات، هاوکات ستافی بەڕێوەبردنیش توانیویانە فاکتەرێکی لە بار بن بۆ راگرتنی دڵی ئەو کەسانەی حەواڵەکانیان لە کۆمپانیای تەتەرەوە دەکەن.

برادەرانی (تەتەر) ساڵێك زیاترە هەست دەکەن کە مشتەریەکانیان بە ناوی کەمی مامەڵەکانیانو دابەزینی ئاستی بازار حەواڵە کەمتر دەکەن، ئەو بڕە پارانەی ساڵان دەکرا دەیان جار زیاتر بوو لەوەی ئێستا، لە کاتێکدا دەبوو پێچەوانە بوایە، دەبوو ئێستا خەڵکێکی زیاتر مامەڵەی لەگەڵ بکردنایە نەك کەم بکەن.

فاکتەری ئەو نزم بوونەوەیە وەك خۆشیان دەیزانن ئەوەیە کە یەکێك لە دامەزراوە دراوییەکانی جیهان بە ناوی (ترێزەرترانس) (Treasure trans) دەستی گەیشتۆتە هەرێمی کوردستانو لە رێی یەکێك لە بانکە ئەهلیەکانەوە هەڵدەستێ بەکاری حەواڵەکردن بۆ هەر سوچێکی جیهان بێت، بەبڕی تەنها ($٥٠) بۆ هەر بڕە پارەیەكو لە ماوەی یەك هەفتەدا پارەکە دەگاتە حیساب بانکی مەبەست. ئەمە وایکردووە لەو کەسانەی مامەڵە چی بوون لەگەڵ (تەتەر)، ئێستا بەناوی بازار کەمیو نەمانی کارەوە تەنها بۆ مەبلەغی کەم لە دەرگای تەتەر بدەن.

هاوبەشەکانی کۆمپانیای تەتەر هەست بەو هەڕەشەیە دەکەن کە بەرەو roوویان بۆتەوە، کاتێك وێنای تواناو قەبارەی ئەو بەراورد دەکەن بەخۆیان سەریان سوڕ دەمێنێ، دەزانن هەموو ئەو بڕە پارەیەی ئەمان لە ساڵێکدا بە هەموو توانای خۆیان حەواڵەی دەکەن زۆر کەمترە لەوەی کە لە یەك رۆژدا (Treasure trans) دەیکات، دەزانن ئەمان تەنها (٢١) ساڵە لەو بوارەدا خەریکنو زادەی بارودۆخێکی تایبەتن کە بەسەر عیراقدا هاتووە کە لە رووی رامیاریو ئابورییەوە گۆڕانی گەورە روویداوە.

بەڵام رکابەرە نوێیەکە (٩١) ساڵە قاڵ بووی ئەم بوارەیە. ئەمان واتە تەتەر گەر زۆر هێز بدەنە بەر خۆیان لەوانەیە بتوانن لقێکی تر لە هەولێر بکەنەوە، بەڵام (ترێزەر ترانس) جگە لەوەی کە لە سەدو شەستو سێ شاری جیهانیدا لقی فەرمی خۆی هەیە، لە سەدان شاری تریشدا لە رێی بانکە لۆکاڵەکانەوە کارەکانی خۆی رادەپەڕێنێ، جگە لەمانەش ئەم دامەزراوەیە لە پلانی دەساڵی داهاتوویدا بۆ عیراق مەبەستێتی نەك تەنها لە شارەکان، بەڵکو لە هەمو قەزایەکیشدا لقێکی تێدا دەکاتەوە، بە کورتی ئەوان زۆر باش دەزانن کە باسکردن لە بەراورد باسکردنە لە جیاوازی ئاسمانو رێسمان.

ئەو بەراوردانە هاوبەشو بگرە کارمەندەکانی کۆمپانیای تەتەری بێ هیوا کردووە لە تەتەر، هەروەك خۆشیان دەیڵێن ناتوانن واز لەو کارە بهێنن، ئەوان لەو گۆڕانە

گەورانەدا کە بەسەر عیراقدا هاتن نەیانتوانی کارێکی باشتر بنیات بنێن، ئێستا بێگومان ناتوانن بە ئاسانی کارێکی تر بکەن.

ئایا هیوایەك یاخود ئەگەر بوارێکی تەسکیش بێت ماوەتەوە بۆ تەتەر کە بتوانێت سەر لە نوێ ببوژێتەوە؟

خاڵی لاوازی رکابەرەکەت بگرە، بەوەی کە سەرچاوەی هێزی بزانیت (مایکڵ دێڵ).

راستەوخۆ دەڵێم: (مایکڵ دێڵ) بەو زەبەلاحیەوە بزانێت کە رکابەری هەیە، کەواتە ئاساییە نوسینگەیەکی گۆڕینو حەواڵەی دراو رکابەری هەبێت، ئەو حاڵەتە لە گلۆبالیزەدا ئاساییە کە کۆمپانیا قەبەکان وەك ئەختەبوت پەلیان بە هەموو لایەکدا بڵاوبکەنەوە. بێگومان هەر جێگەیەکیش پەلی ئەوانی بۆ بکشێ ئەوا پرۆژە لۆکاڵە هاوشێوەکانی ئەم یەکەم زەرەرمەندی ئەو سنور بەزاندنە دەبن. هەر بۆیە لە جیهاندا چەندین رێکخراوی دژ بە جیهانگیری دروست بوون، نموونەیان وەك رێکخراوی (ئاتاش) لە فەرەنسا.

باشتر وایە برادەرانی (تەتەر) ئاگاداری ئەوە بن کە (T.T) یش رکابەری خۆی هەیە، جگە لەوەش لە بازاڕی ناوخۆشدا تەتەر بە دڵنیاییەوە رکابەری خۆی هەبووە، بەڵام لەوانەیە ئەوەی ئەمانی ورکردووە قەبارەی (T.T). هەر ئەو زل قەبارەییە وایکردووە لە (T.T) نرخی خزمەتگوزارییەکانی هەرزان بێت.

کەواتە لەمەوە پێویستە تەتەر بزانێت دیاریکردنی نرخ لە دەستی بازاری ناوخۆدا نەماوە کە کاریگەر بوو بە دۆخێکی زۆر لۆکاڵی، ئەو کات هەرێم بارودۆخێکی زۆر جیاوازی هەبوو لە ئێستا.

بۆ تێگەیشتن لە کێشەکە، پێویستە لە جۆری ئیشو چالاکیەکەی تەتەر تێ بگەین: ئاشکرایە ئەو کارەی تەتەر خزمەتگوزارییە واتە کالآیەك نییە کە بۆ نوێگەری یان چاکسازی پێویست بە سەرمایەی زۆر بکات. لێرەوە دەبێت تەتەر هەوڵی باشکردنی (جودە)ی کارەکەی بکات، (جودە)ش لەو کارەدا لەسەر دوو خاڵ بەندە ئەویش: نرخ + کاتی گەیاندن.

لەو روانگەیەوە تەتەر دەبێت چەند خاڵێك بە هەند بگرێت:

١- پێداچوونەوەی ئەو نرخانەی کە پێشتر کاری پێکراوە، چونکە پێشتر نرخی حەواڵە بە پێی بڕی پارەکە گۆڕاوە، بەڵام ئێستا لە دوای هاتنی (T.T) نرخی حەواڵە بە پێی وەجبەیە نەك بە پێی مەبلەغی پارەکە، ئەم ئەگەر نەتوانێت کەمتر لەو نرخ دابنێت ئەوا خۆ دەتوانێت وەك ئەو نرخ دیاری بکات.

٢- بێگومان دامەزراوەی (T.T)یش رکابەری هەیە، بۆیە گەڕان بە دوای ئەو لینکانەدا بۆ گەشتن بە رکابەرەکانی ئەرکێکی زۆر هەنووکەییە پێویستە برادەرانی تەتەر پێی هەستن، چونکە ئۆتۆماتیکی رکابەری (T.T) دەبێتە هاوبەشی تەتەر.

٣- تەتەر دەتوانێت بە هۆی زوو گەیاندنەوە پارسەنگی ئەو حاڵەتە بدات، (T.T) لە ماوەی یەك هەفتەدا ئەنجام دەدات بە دەستەوە، ئەمان واتە تەتەر هەوڵی کەمکردنی ئەو کاتە بدەنو بەهەمان نرخ.

٤- هەرچەند تەمەنی (T.T) نزیکە لە سەدەیەك بەڵام لە کوردستاندا تازەیە، کەواتە ئەو لە سەرەتای (بناغە دانان )دایە، بۆیە یەکەم سەنگەر کە پێویستە تەتەر بیگرێ سەنگەری پاراستنی مشتەرییەکانییەتی کە لە مێژە لەگەڵیدا مامەڵە دەکەن، بەوەی کە خزمەتێکی زیاتریان بکاتو چەند (إمتیاز)ێکیان بداتێ تاوەکو وەلائیان بپارێزێ، لە بازاری ئازادو پڕ لە شانکێدا دەرکەوتووە کە زیادکردنی مشتەری نوێ گرانترو بە مەسرەفترە لە پارێزگاریکردنی مشتەرییە کۆنەکان، بە پێنج هێندە. بۆیە وەك زامنێك بۆ مانەوەی (تەتەر) بە نرخی تازەوە پێویستە هەوڵی پەرەوازە نەبوونی لەوەو پێشی بدات.

ئاماژەیەکی گرنگ کە پێویستە بدرێ بە گشتیو سەبارەت بەو جۆرە کارە، پێویستە هاوبەشەکانی کۆمپانیای تەتەر ئەوە بزانن ئەو بارودۆخەی ئەوان تێیدا دەرکەوتن بارودۆخێکی جیابوو لە ئاسایی، ئەوان کاتێك -وەك زۆرینەی هاوبەشەکانیان- دەستیان کرد بەو کارە سیستەمی بانکی لە هەرێمدا نەمابوو بۆیە توانییان ئەو بۆشاییە پڕ بکەنەوە، بەڵام لە دوای پرۆسەی ئازادییەوەو دەرکەوتنی بانکە ئەهلیەکان بەگشتی، ئەو جۆرە چالاکیە هێدی هێدی دەچێتە ژێر چەتری بانکەکانەوەو تەنها گۆڕینی دراو دەمێنێتەوە بۆ نوسینگەو کۆمپانیا دراوییەکان، بۆیە پێم وایە ئەوان دەگەنە سێ ریانێك تاوەکو چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن:

ڕێگەی یەکەم: بوون بە بانکێکی سەربەخۆ وەك بانکەکانی ترو کارکردن بە دیسپلینی بانکی.

ڕێگەی دووەم: رێککەوتن لەگەڵ یەکێك لە بانکە ئەهلیەکان تاوەکو بتوانن لە داهاتوودا پشکێکیان لە دنیای حەواڵەدا هەبێت.

ڕێگەی سێیەم: خۆ یەکلاکردنەوە بۆ بواری گۆڕینی دراو بە تەنهاو لە چەند جێگەیەکی گشتی لە شارەکان نوسینگە بۆ ئەو مەبەستە بکەنەوە.

# خەندەی کارگێڕی

محەمەد ئالانی

★ پاش بەسەر بردنی مۆڵەتی هەفتانەی بەڕێوەبەر لە یەکێك لە شوێنە گەشتیارییەکان زۆر بە رووخۆشیو بە دڵێکی کراوەوە گەڕایەوە سەر کارەکەی، کارمەندەکانی کۆکردەوەو نوکتەیەکی بۆ گێڕانەوە، هەموو کارمەندەکان پێکەنین تەنها یەك کارمەند نەبێت، پاشان نوکتەیەکی تری بۆ گێڕانەوە دووبارە هەموویان پێکەنین جگە لەو کارمەندە.

جەنابی بەڕێوەبەر روخساری سوور هەڵگەڕاو بە توڕەییەوە لێی پرسی: خانم بۆ پێناکەنیت؟ ئایا حەزت لە قسەی خۆش نییە؟

کارمەندەکەش زۆر بە هێمنی وەڵامی دایەوەو وتی: لەمەودوا روخۆشو دەم بە پێکەنین نابم، چونکە ئەم بەیانییە بڕیارمدا کەواز لە کارەکەم بهێنم، ئیتر چی دی بە زۆرو بە بێ هۆ ناچار ناکرێم خۆم بهێنمە پێکەنین!

★ چۆن بویتە ملیۆنێر؟

منداڵێکی بچوك لە ملیۆنێرێکی بە ناوبانگی پرسی: چۆن توانیت ئەو سامانە بێ شومارە کۆبکەیتەوە؟

ملیۆنێرەکەش وەڵامی دایەوە: گەشتم کرد بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو چەندین کاری جۆراو جۆرم کرد، پاشان چوم بۆ ئەوروپاو لەوێش بەهەمان شێوە کارم کرد، لە پڕ ملیۆنێرەکە بێدەنگ بوو!

منداڵەکە: پاشان چی؟ ملیۆنێر: پاشان دوای ئەو تێکۆشانو هەوڵو ماندووبونە زۆرەم گەڕامەوە بۆ نیشتمانەکەم.

منداڵەکە: بەڵام پێت نەوتم چۆن بویتە ملیۆنێر؟

ملیۆنێر: دوای ئەوەی گەڕامەوە باوکی هاوسەرەکەم کۆچی دوایی کردو ئێمەش بوین بەمیراتگری ئەم سامانە بێ شومارە!

بەشی یەکەم




# چۆن زۆرترین بەرهەم لە کەمترین کاتدا بەدەست دێنیت؟

١١٣ شێوازو ڕێگا بۆ یارمەتیدانت لە سەر بەرزکردنەوەی ڕێژەی بەرهەم هێنان و زاڵبوون بەسەر ڕێچکەی دواخستن، ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە ڕووداوەکان زۆر بە پەلە تێدەپەڕن،و زۆر بە ئاستەم هەست بە کاتمان دەکەین، کە چۆن تێدەپەڕی؟ چۆن بەسەری دەبەین؟ هەموومان پێویستمان بە ڕێکخستنی بیرو کات هەیەو هەوڵ دەدەین کە لە هەموو چرکەیەکی ژیانمان سوودمەند بین، بانگەوازی ژیانێکی باشترو کارێکی چاك کە بەرەو سەرکەوتنمان دەبات، لێرەدا دەتوانین لە ڕێگای ئەم پەرتوکەی کە لە نووسینی (روبرت بودش)ەو (منال مصطفى) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیو ئێمەش وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی تاوەکو تاکی کوردیش بزانێ چۆن دەتوانێ زۆرترین بەرهەم لە کەمترین کاتی دیاریکراو بە دەست بهێنێت، دڵنیام خاڵێکی گۆڕان دەبێت لە شێوازی بیرکردنەوەو ڕاپەڕاندنی کارەکان بفەرموون:

## بیرکردنەوە:

١- کاتی تەواو نیە بۆ ئەنجامدانی هەموو شتێك: ئەم ڕاستیە بە سانایی وەربگرەو پێویستیشە کە تیشك بخەینە سەر شتە هەرە گرنگەکان،و ئەگەر ئەمەشت پەیڕەو کرد لە کارەکەت و ژیانی تایبەتیت، تۆ زۆرترین بەرهەم دەهێنی بە چاکیو کاتت بەڕێوە دەبەیت.

٢- پاککردنەوەی بیرت، ئارام بە: تیشك بخەرە سەر کارەکانت و هەر شتێکی تر وەلاوە نێ، دوودڵی زۆر وادەکات کارەکانت ئاستەمتر بێت وەك ئەوەی کە هەیەو دەتوانی زاڵ بیت بەسەر پاککردنەوەی بیرت کە وابکەیت کە هیچ پەستانێکی دەرەکی کارت لێ نەکات، بە باشی لەوە بگەیت کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت و هەڵسە بە ئەنجامدانی بە ئارامیو متمانە بە خۆ بوونت.

٣- هەوڵ مەدە کە سروودی هەموو شتێك تەواو بچڕی: چونکە ئاسانە بکەوینە چاڵی هەوڵدان بۆ ئەوەی وا بکەیت کارەکەت کەمێك باشتر بێت، لە زۆربەی کاتیشدا هەوڵەکانی چاککردنەوەی کارەکان کاریگەری دەبێت لە سەر ئەنجامی گشتی، سەرەڕای زۆربوونی بەکاربردنی کات و کۆششی بەبێ پێویستی بوون.

٤- ناتەواویو خۆشی بەرهەمەکانت بە شێوەیەکی ئاسایی وەربگرە: چونکە سروشتی مرۆڤایەتیە، سوودی نابێت کە سەرزەنشتی خودی خۆت بکەیت و هەرکاتێك کە ڕێژەی بەرهەمت کەمدەبێتەوە پێویستە بوەستیت و دووبارە بیر بکەیتەوە، بیرمەکەوە لە هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی پێشووت و بە سانایی وەریبگرەو درێژە بەکارەکانت بدە.

٥- وا لەگەڵ شوێنی کارەکەت هەڵسوکەوت بکە وەك شوێنی بەرهەم هێنان: بیرو هۆشت ئامادەبکە بۆ بیرکردنەوە لە نووسینگەکەت وەکو شوێنێك بۆ ئەنجامدانی کارەکانت، بەردەوام بەم شێوەیە بیر بکەوە، خۆت دەبینیتەوە کە زۆرترین بەرهەمت هەیە لە کاتی بوونت لەم شوێنە، شوێنێکی تر تەرخان بکە بۆ کارەکان و ڕووداوەکان و چالاکیە کەمتر گرنگەکان، شوێنی کارەکەت با بۆ چالاکیە زۆر گرنگەکان بێت.

## پلاندانان:

٦- لیستێك ئامادەبکە بەو کارانەی کە پێویستە ئەنجامی بدەی، هەموو ئەو بیرانەی کە بە هۆشت دادێت بیان نووسە، وەك نوسینی هەموو شتێك لەسەر لاپەڕە، مەوەستە بۆ داڕشتنی شێوازێك، یان بیرکردنەوە لە خاڵێك، ئەوەی لەسەرتە کە بەردەوام بی لە سەر نوسینی ئەم لیستە هەتا تەواو دەبێ.

٧- لیستەکەت بە گوێرەی گرنگی ڕێکبخە، ئاسانترین ڕێگاش بریتییە لە دابەشکردنی هەر بابەتێك بۆ سێ بەشی سەرەکی:

أ- پەلەیەو گرنگە.

ب- گرنگەو پەلە نییە.

ج- نە گرنگەو نە پەلە.

خاڵەکانی (أ) زۆر گرنگە بۆیە هەر لە پێشەنگدا دەبێت، خاڵەکانی (ب) لەدوایدایە لە گرنگی،و خاڵەکانی (ج) نایەوێ کاتی بۆ بە فیرۆ بدەی، وەرگرتنی کاتی پێویست بۆ دیاریکردنی یەکەمینەکان یارمەتیت دەدات بۆ ئەنجامدانی کار لە دوای کار، بە بێ وەستان بۆ دیاریکردنی گرنگی هەنگاوەکانی بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە.

٨- بە گوێرەی هەستت پێشبینی هەنگاوە گرنگەکان بکە، چونکە زۆر کەم شەرمەزارت دەکات.

٩- زۆر بە سادەییو ئاسانی هەڵسە بە

لابردنی هەنگاوە نا گرنگەکانی نێو لیستەکە، لە خۆت بپرسە: کە چی خراپتر روودەدات کە هەڵسای بە لابردنی هەر هەمووی بە یەکجاری؟ کە بینیت دەتوانی بەرگەی دەرەنجامەکەی بگری بە بێ زیان، یەکسەر لایبەرە.

١٠- دواخستنی کارە ناپێویستەکان بۆ بەرژەوەندی هەرە پێویستەکان: دەکرێ لە ئێستادا هەموو کارەکان ئەنجام نەدەین، هەندێ جار پەکی دەکەوێت لە لایەن هەڵسورێنەران‌و جێبەجێکاران، یان سوود مەندەکان خۆیان، ئەوەش لابەرە کە دەتوانیت، ئەم کاتەش بقۆزەرەوە بۆ جێبەجێکردنی هەنگاوە هەرە گرنگەکان بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە.

١١- پەرە بە نووسینی پلانەکەت بدە لە سەر کاغەز بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کارەکان، جا چ گەورە بن یان بچووك، ئەو سەرکەوتنەی کە زۆرێك بە دەستی دەهێنن دەگەرێتەوە بۆ وردی پلاندانان لە ژیانیان، نەخشەکەی بکێشەو لە سەری بەردەوام بە، کارێکی سانایە بەلام کاریگەری زۆرە.

١٢- وەبەرهێنانی کات فاکتەرێکی داواکراوە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هەموو کارێك لە سەر لیستەکە، کاتی پێویست دیاری بکە بۆ هەموو کارەکان وەکو گەشت‌و چاوپێکەوتن‌و پلاندانان....هتد، لە بیرت نەچێت کە کاتی لە دەست چووت بخەیتە سەر کاتی بەردەست بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارانە.

١٣- بوەستەو بیر بکەوە لەوەی کە پلانی بۆ دادەنێی، چۆن دەتوانی بە ئەنجامی بگەیەنی بە شێوەیەکی زۆر کاریگەر؟ چەند خولەکێك تەرخان بکە بۆ کورت کردنەوەی پلانەکەت، چونکە دەست پێکی کورت‌و سادە چەندان کاتژمێرت لە دوو دڵی بۆ دەگێرێتەوە.

١٤- ئامانجەکەت دیاری بکە، بینوسەو بیخەرە بەردەمت‌و ئەوەش دیاری بکە کە کاری بۆ دەکەیت، ئامانجەکانت لە پلانە رۆژانەییەکەت تۆماربکەو بەردەوام پێیدا بچۆرەوە، لە دوایدا کاتێکی رێکی بدەیە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی هەر ئامانجێك.

١٥- پلانێکی نەرم‌و نیان‌و ورد دابنێ بۆ هەر پرۆژەیەك، ئەو ئامانجەی کە بە نیازی بە ئەنجامی بگەیەنی لە سەرەتای لیستەکە، دەتوانین هەموو هەنگاوەکان هەڵبسەنگێنین بە دیاریکردنی کاتی کۆتایی بە ئەنجام گەیاندنی، مەبەست لە پلانی نەرم‌و نیان‌و ورد ئەوەیە کە بەردەوام دابەش دەبێت بۆ هەنگاوی بچووکتر، و لە هەر ریزێکدا هەڵسە بە ریزکردنی کارەکان بە گوێرەی گرنگی، پلانی نەرم‌و نیان پاڵپشتە بۆ ئەو هەڵوێستانەی کە راستەوخۆ بەرەو بە جێ گەیاندنی ئامانجەکەت دەبەن.

بەشی یەکەم

# شێوازەکانی بەڕێوەبردن

ئاوات تەها/ کۆلێژی پەروەردەو بەڕێوەبردن

**بەڕێوەبردن:**

بەڕێوەبردن لای (عبدالکریم دەروێش) بەم شێوەیە پێناسە دەکرێت:

(بە مانای دابینکردنی جۆرێك لە یارمەتی‌و تەنسیق لە نێوان هەوڵی مرۆیی جیاواز لە پێناو گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراودا).

**جۆرەکان‌و شێوازەکانی بەڕێوەبردن:**

جۆرەکانی بەڕێوەبردن زۆرەو جیاوازە لە سیفاتەکانی بەڕێوەبەردا، بە لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوە بەڕێوەبردن دابەشکراوە بەسەر ئەم شێوازانەدا:

١- شێوازی دیموکراتی.
٢- شێوازی دەسەڵاتداری.
٣- شێوازی چاوپۆشیکەر.
٤- شێوازی دبلۆماسی.

**یەکەم/ شێوازی دیموکراتی:**

وشەی دیموکراسی سەرچاوەکەی وشەیەکی یۆنانیە کە لە دوو وشەی (دیمو) کە مانای میللەتەو ( کراتی) ش مانای دەسەڵاتە بۆیە مانای دەسەڵاتی میللەتە.

وەکو (نتس) دەڵێت: سنوورە بایلۆژیەکان‌و دەروونیەکانی مرۆڤ وای لێکردووە کە هاوکاری بکات لەگەڵ هاوەڵانی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، بۆیە بەرە دیموکراتیەکان باوەریان وایە کەوا بەیەکەوەبوونی کۆمەڵێ عەقڵ بە تواناترە بۆ داهێنانی بیرۆکەی راست لەیەك عەقڵ هەر چەندە ئەو عەقڵەش بە توانا بێت.

هەروەها (بلاك) دەڵێت: بەڕێوەبەری ئەم جۆرە باوەری بە خۆی هەیەو تواناو کاریگەری باشی هەیەو رۆڵی ئاراستەکردن‌و سەرکردەیی بۆ سەرجەم چالاکیەکان هەیە، ئەم شێوازە پشت دەبەستێ بە بەشداری بەڕێوەبردن‌و رێزگرتن‌و گرنگیدان بە گشت تاکەکان‌و گیانی یەکسانی‌و داهێنان‌و بەشداری لە بڕیارەکان‌و جێبەجێ کردنیان.

بەڕێوەبەری دیموکراتی جیادەکرێتەوە بە چەند تایبەتمەندییەك کە ئەمانەن:

١- بوونی رێزگرتن لە نێوان بەڕێوەبەرو کارمەندان.

٢- پەیرەوکردنی رێبازی یەکسانی لە ماف‌و دەستکەوتەکان.

٣- رێگە خۆشکردن بۆ بوارەکانی گەشەپێدانی پیشەیی‌و وەزیفی کارمەندان.

٤- پەیرەوکردنی شێوازی گەشەپێدانی کەسایەتی کارمەندان‌و دروستکردنی رۆحی متمانە لە نێوانیان‌و لە کەسایەتی خۆشیان‌و رێزگرتنی کەسایەتی تاك وەك مرۆڤێك.

٥- بە کارهێنانی دەسەڵات لە چوارچێوەی یاسایی دوور لە ناکۆکیەکانی تاکە کەسی.

**دووەم/ شێوازی دەسەڵات سەپاندن «دیکتاتۆری - ئۆتۆکراتی»:**

ئەو شێوازەیە کە باوەری بە سەپاندن‌و کۆنترۆڵ کردنەو متمانەکردن بە دەرکردنی فەرمانەکان‌و داواکردنی لە فەرمانبەران‌و گەرانەوە بۆی لە هەموو شتێکی گەورەو بچووك‌و پابەندبوون بە گشت فرمانەکان، رێ نەدان بە بەخشینی دەسەڵاتەکانی بۆ کەسانی تر، بەڕێوەبەر بە رووکەش هەمیشە ملکەچ بۆ کراوە بەلام لە راستیدا خۆشەویست نیە لە لایەن کارمەندەکانیەوە.

بەڕێوەبەری دەسەڵات سەپێنراو وەسف دەکرێت بە:

١- بنەرەتی بیرۆکەی کارگێری ناکۆکییە لەسەر سەرۆکایەتی‌و بنچینەی سیاسەتیش فەلسەفەی دەرگای داخراوە.

٢- پەیوەندییەکان لەم جۆری شێوازی کارگێرییەدا بنەرەتی بە ترس‌و تیرۆرو پەیرەوکردنی رێنماییەکان‌و جێبەجێ کردنی بە بێ گفتوگۆو راگۆرینەوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئامانجەکان روون نەبێت لە لایان.

٣- رێنەدانی زۆر بە ئازادی‌و پێشخستن لە کار بەڵکو لە کاری کارمەندان.

٤- لەم جۆرە شێوازی کارگێرییەدا پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان شێوازی فەرمی باڵی بەسەردا کێشاوە.

٥- لە کۆبوونەوەکاندا تەنیا بەڕێوەبەر رای خۆی دەردەبرێ، بڕیارەکان بەبێ بەشداریکردنی کەسانی تر دەردەچن.



محەمەد هاشم
iraq@edara.com

ئاشکرایە لای هەمووان کە زۆربەی خاوەن کۆمپانیاو کارگەو پرۆژەکان تەنها خەریکی جێبەجێکردنی پرۆژەکانیانن، بەلام بەکەمی دەبینین کە خەریکی پلاندانان بن بۆ ئیش‌و کارەکانیان.

لەراستیدا کەسانی جێبەجێکار کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لە بواری سەرکەوتنی کەسێتی تاکدا، ئەمەش خالێکە بووەتە هۆی ئەوەی کە بەلێندەرەکانمان بەرهەمهێن نەبن! بەلکو لەجیاتی ئەوەی بیربکەنەوە بۆ دانانی پلانێکی سەرکەوتوو، رۆژانە دەکەونە رێ بۆ ئەوەی یەکسەر دەست بەئیش‌و کارەکانیان بکەن.

زۆربەی خاوەن پرۆژەکان دووچاری کێشە دەبنەوە کاتێک کە چالاکییەکانی بازارگێری بەشێوەیەکی نادروست جێبەجێ دەکەن، بۆیە ئەگەر دەتەوێ چالاکییەکانی بازارگێری بەشێوەیەکی راست‌و دروست جێبەجێ بکەیت پێویستە دەست بکەیت بەدانانی پلانی بازارگێری.

لێرەدا باسی چەند رێگایەکی ئاسان دەکەین بۆ دانانی پلانی بازارگێری‌و پێویست بە دیراسەتی قول‌و درێژ ناکات، باپێکەوە دەست بەهەنگاوەکان بکەین.

هەنگاوی یەکەم: بەتەواوی دیراسەتی بازار بکەو تێگەیشتنی دروست بەدەست بهێنە سەبارەت بە بازارو ئەوانەی کە (منافسە)ت دەکەن.

هەلەو تێنەگەیشتنێک هەیە لەلایەن خاوەن پرۆژەکان، ئەویش دەستگرتنیانە بەبەرهەمێک یان خزمەتگوزارییەکی تایبەت، لەجیاتی ئەم پەیوەستبوونە پێویستە لەسەریان لەسەرەتاوە بزانن کە بازارەکان پێویستیان بەچی هەیەو بەتەواوی لێی تێ بگەن.

لێرەدا ئەگەر بتەوێ بەرهەمێک بفرۆشی کە خەلکی نەیەوێت ئەوا نایکرن، بازاری سەرکەوتوو ئەو بازارەیە کە کۆمەلە کەسانێکی تێدا هەیە کە پێداویستییەکانیان جێبەجێ ناکرێت، بۆیە یەکسەر کریارەکان هەولی ئەوە دەدەن کە بگەنە لای تۆو کێشەکەیان چارەسەر بکەیت (فرۆشتنی بەرهەم‌و کالاکان بێت یان پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری).

هەر بۆیە ئەگەر دەتەوێ تێگەیشتنێکی باشت هەبێت بۆ ئەو بازارەی کە کە ئیش‌وکارەکانی تێدا ئەنجامدەدەییت، ئەوا پێویستە چەند پرسیارێک لەخۆت بکەیت:

١. ئایا گرنگی دان بەبەشێکی بازار گرنگی کەمترە لە لایەکەی تری؟

٢. تاچەند دەتوانی دەست بگریت بە بەشەکانی بازارەوە بۆ ئەوەی لەدواییدا بەقازانجەوە دەرچیتە دەرەوە نەک بە دۆراوی.

٣. ئایا کەسانێکی زۆر هەیە کە کێبڕکی (منافسە) بکەن لەگەلتدا، لەو بەشەی کە دەتەوێت کێبڕکێیان (منافسە) لەگەلدا بکەیت.؟

٤. ئەو خالە لاوازانە چین کە لە رکابەرەکانتدا هەیە، بۆ ئەوەی بتوانی بیقۆزیتەوە؟

٥. ئایا ئەو بازارەی کە نیازی کارکردنت تێدا هەیە پێویستی بەهەردوو ئۆفەری (مونافەسەوجیاوازی هەیە لەبەرهەمەکان) هەیە یان نا؟

هەنگاوی دووەم: هەول بدە کریارەکانت بناسەو بزانە لەچی جۆرێکن!

زانینی جۆری کریارەکانت یەکەم هەنگاوە بۆ دروستبوونی فرۆشتنێکی ئاسان، لەبەر ئەوەی تۆ ناتوانی پلانێکی بازارگێری دابنێیت تا نەزانیت:

❖ کریارو بەکاربەرەکانت کێن؟

❖ حەزو ئارەزووی چی دەکەن؟

هەروەکو ئاگادارن لە زنجیرەکانی پێشوو باسی چوار توخمەکەی بازارسازیمان کردو جیاوازی نێوان ئارەزوو پێداویستییەکانمان خستە روو، بۆیە زۆر پێویستە ئەم دووانە تێکەل بەیەکتری نەکەین، چونکە مەرج نییە خەلکی ئەو کالایانە بکرن کە پێویستیان پێیەتی! بەلام هەموو کاتێک و بەبەردەوامی ئەو شتانە دەکرن کە حەزیان لێیەتی، بۆنموونە: زۆر جاری وا هەبووە کە کەسێک دەچێت بۆ بازار و پێویستی بەکرینی پانتۆلێک بووە، بەلام کاتێک کە دەبینی لەبازار دەردەچێت (قەمیس‌و پێلاووچاکەتێک)یشی لەگەل دەستی خۆیدا کریوە؟

ئەو کەسانەی کە دێن بۆ مارکێتەکان پێویستییان بە کرینی هەندێک (شیرو هێلکەو پەنیر) هەیە، دەبینین لەکاتی دەرچوونیان کۆمەلە شتێکی تری زیادە کە لەوکاتەدا ئارەزوویان لێبووەو کریویانە وەکو (ماست‌و نەستەلەو شەربەت‌و گۆڤارو... هتد)، بۆیە لێرەوە دەگەینە ئەو راستییەی کە خەلکی (ئەو شتانە دەکرن کە ئارەزوویان لێ هەیە (باهەندێ جار پارەشیان پێ نەبێت) نەوەکو ئەو شتانەی کە پێویستیان پێیەتی!) بۆیە ئەگەرتۆ کاروباری بەرێوەبردنی فرۆشتنی هەر جێگایەکت لەبەردەستدایە ئەم رستەیە لەبیر مەکەو جێگیری کە لەبیرو هۆشدا.

لەهەمان کاتدا ئەگەر دەتەوێت زانیارییەکی باش‌و پوخت دەربارەی هەمیشە کریارو کریارەکانت بزانیت ئەوا ئەم پرسیارانە ئاراستەی خۆت بکە:

١. بە چ شێوەیەک کریارەکان ئەم بەرهەمە دەکرن؟ لەرێگای ( بازار، سوپەرمارکێت،



# حەوت هەنگاو بۆ نووسینی پلانێکی بازاڕسازی لە ماوەی یەك ڕۆژدا

ئینتەرنێت ... هتد)؟

۲. کێ زیاتر کارگەریەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر کرداری کرینەکە (ژن، پیاو، نوێنەری فرۆشتنی دەزگاکە، بەڕێوەبەری پرۆژە، سکرتێر، ... هتد)؟

۳. ئەو ئاکارو ڕەوشتانە چییە کە کڕیارەکان هەیانە، بۆ نموونە: چۆن کڕیارەکان زانیاریەکانیان دەستدەکەوێت، لە ڕێگای (تەلەفزیۆن، گۆڤار، ڕۆژنامە، رادیۆ، هەڵواسینی پۆستەر، سیمینار کردنو ...هتد)؟

٤. ئەو داینەمۆ سەرەکییە چییە کە سوودوکاریگەری هەبێت لەسەر کڕیارەکان کاتێك کە بەرهەموکالاکەیان کڕی، ئایا کڕیارەکەت (بەهێز دەبێت، دووردەکەوێتەوە لە ئازار، دەوڵەمەند دەبێت، تەندروستی باشتر دەبێت، زیاتر کۆمەڵایەتی تر دەبێت، ... هتد)؟

هەنگاوی سێیەم: دەست نیشان کردنی ئامانجەکانو دەست گرتن پێیانەوە:

ئەگەر بڵێین هەموو خەڵکی کڕیاری کاڵاکانی تۆن، ئەوا کەس نابێتە کڕیاری بەرهەمەکەت.

پەیوەست بوونی سەرەکی بازاڕ بەندە بە کێبڕکێ (منافسە)وە، دروستکردنی شەپۆلێکی گەورە لەناو گۆمێکی بچووك باشترە لەوەی دووچاری بازدان بیت لەناو کەنداوێکی گەورەدا.

ئامانجوبوارەکانی خۆت دیاری بکەوزاڵ بە لەسەری، پاشان جووڵە بکە بەرەو ئامانجەکانی تر بەڵام (دوای ئەوەی بەتەواوی دەستت لەسەرەتاکەی گیر دەبێت).

بۆ نموونە :ئەگەر تۆ سەرتاشێك یان دارتاشێکی باشبیتوشارەزاییەکی تەواوت هەبێت لەکارەکەی خۆت ئەوا بێ گومان سەردەکەویت ئەگەر لە جێگایەکی باشوتایبەت لەناو شارۆچکەکەی خۆتدا کاربکەیت، پێویستە یەکەم جار زۆر بە زیرەکانە ئەو کارە هەڵبژێریت کە دەتەوێتو ئارەزووی ئەنجامدانیت هەیەو بەئاسانی بتوانیت دەستت لێ گیربێت،و هیچ شتێك لەوە خراپتر نییە کە کارێك یان ئەنجامێك دەست نیشان بکەیتو پاشان نەتوانیت بەردەوام کاری بۆ بکەیتو ئارەزووی کارکردنت تێدا لاواز بێت.

هەنگاوی چوارەم: پەرەدان بە پەیامو زانیاریەکانی بازاڕگیری:

تۆ بەگەیاندنی پەیامو زانیارییە بازاڕسازییەکانت بۆ کڕیارەکان تەنها نیازی خۆت دەرنابڕیت کە چاوەڕێی چی لە کڕیارەکانت دەکەیت بەڵکو هانیان دەدەیت کە تەنها لەتۆ بکڕن، لە کاتی دەست گرتنت

بەسەر بیروهۆشی کڕیارەکانتدا پێویستە پەرە بەهەردوو لایەنی بازاڕ گیرییەکەت بدەیت.

یەکەمیان: بەچەند وتەیەکی زۆر کورت پەیامەکەت بگەیەنە لەکاتێکدا لەشاشەی TV دەردەکەویت وەکو بەڕێوەبەرێکی کارگێڕی بۆ ماوەی ٣٠ چرکە، پرسیارێکی هەستیار رووت تێ دەکات! لەوکاتەدا چی دەکەیت؟ لەوانەیە ئەمە یەکەمو دوا بوار بێت لەبەردەمی هەموو ژیانتدا بۆ ئەوەی بتوانی ئامانجی بازاڕگیرییەکەت بخەیتە روو و هەوڵ بدە پەیامەکەت زۆر ئامانجدار وکاریگەر بێت.

دووەمیان: لە پەیامی بازاڕگیرییەکەتدا ئەو زانیارییە تەواوانە دادەنێیت لەناو هەموو ریکلامو رەواجدانەکەدا.

بۆ ئەوەی نامەکەت کاریگەرو باوەڕپێکراو بێت، ئەوا پێویستە ئەمانەی خوارەوە لە خۆی بگرێت:

١. جەخت کردنە سەر ئەوەی کە کێشەکە زۆر گرنگەو پێویستە چارەسەر بکرێت بەبێ دواکەوتن.

٢. کێشەکە بخەیتە رووو بەتەواوی شرۆڤەی بۆ بکەیت.

٣. روونکردنەوەی پێویست کە تەنها تۆو کارەکانت دەتوانن چارەسەر بۆ ئەم کێشەیە بدۆزنەوە.

٤. باسکردنی وردەکاری تەواو سەبارەت بەو کەسانەی سوودیان لە بەکارهێنانی چارەسەرەکانی تۆ وەرگرتووە بۆ کێشەکان.

٥. توێژینەوەودیراساتی پێویست بۆ ئەوانەی کەیارمەتی دراون بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان.

٦. شیکردنەوەیەك لەسەر چۆنییەتی نرخەکانو پارەدان.

٧. گەرەنتی تەواوی تۆ بۆ بەرهەمەکە.

هەنگاوی پێنجەم: دیاری کردنی شێوازی گونجاوی ریکلام بۆ بازارەکەت:

رێگەی دروست بۆ راگەیاندنی ریکلامەکەت لەبازاڕدا، دادەنرێ بەباشترین وسەرکەوتووترین رێگای پەیوەندی کە دەتوانی لە رێگایەوە پەیامو ئامانجەکانی خۆت بگەیەنیتە نێو کڕیارەکان، بۆیە زۆر پێویستە لەسەرەتاوە بزانیت لە رێگای چ راگەیاندنێکەوە دەتوانیت باشترین ئەنجام بەدەست بهێنیت، ئەمەش واتای ئەوەیە راگەیاندنێك هەڵبژێریت کە بتوانیت ئامانجە بازاڕگیریەکانت بگەیەنێت بە ئەوانەی کە سوود وەردەگرن لەبەرهەمەکان بە کەمترین تێچوو.

لێرەدا کۆمەڵێك لەو رێگایانە دەخەینە روو کە بتوانی سوودیان لێ وەربگریت بۆ بڵاوکردنەوەی نامەوپەیامی بازاڕسازییەکەت:

(رۆژنامەکان، رادیۆ، Tv، گۆڤارەکان، سینەما، پۆستەی ئەلیکترۆنی، لەزگەو هەڵواسراوەکان، تیپەکانی تۆپی پێ، خولی خوێندن، رێبەری بازرگانی، راپۆرتەکان، ریکلامی ناو بازاڕ، باڵۆن، شاشە ریکلامیە گەورەکان، پۆستەی ئەلیکترۆنی، هەواڵەکان، دەزگا خێرخوازیو ئاینییەکان، دەزگا راگەیاندنەکان، بازاڕسازی لە رێگەی تەلەفۆنەوە، ڤیستیڤاڵە تایبەتییەکان، پێشانگاو پێشانگا نێو دەوڵەتیەکان، بڵاوکراوەکان، هەمیشە کڕیارەکان، بەخشینی بڕوانامەی سوپاسوپێزانین، وتار دانی راستەوخۆ، وێب سایت لەسەر ئینتەرنێت، پسووڵەکانی کارکردن، دیراسەتو داتا مەیدانیەکان).

ئامانجەکە ئەوەیە کە بتوانیت نامەکەت لەگەڵ بازاڕدا بگونجێنیت لە رێگای راگەیاندێکی تەواوەوە.

بۆ نموونە: ناتوانیت باسی فرۆشتنی خانوویەك بکەیت لە رێگای گۆرانییەکەوە کە لە یەکێك لە رادیۆ خۆماڵیەکانەوە پروپاگەندەی بۆ بکەیت! ئەمە بەهەڵەیەکی زۆر گەورە دادەنرێت لە بازاڕگێڕیدا!

ریکلامی کاریگەروچاك رادەوەستێتە سەر هەڵبژاردنی بازاڕوپەیامی بازاڕگێڕییەکە،و شێوازی دروست بۆ ریکلام کردن سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت.

هەنگاوی شەشەم/ ئامانجی فرۆشتنو بازاڕگێڕی دیاری بکە:

دیاری کردنی ئامانج بنەمایەکی گەورەیە بۆ سەرکەوتن، دەتوانین بڵێین کە حەزوئارەزوخەیاڵ هەموویان بەئامانج دادەنرێن بەڵام نەنووسراونەتەوە، ئەگەر تا ئێستا ئامانجێکت دیاری نەکردووەو دات نەناوە ئەوا تۆ تەنها هیوا (تمنی)ت وایە کە سەرکەویت.

کاتێك کە ئامانجەکانت دیاری دەکەیتو شێوازێکی جوانو سەرنج راکێشی بۆ دادەنەێیت ئەو کات تۆ دەتوانیت دڵنیابیت کەئامانجەکانت (دەتوانی بڕیاری لەسەر بدەیت، جێبەجێ دەبێت، دەتوانیت پێوەری بکەیت، راستەقینەیە، پەیوەستە بە کاتێکی دیاری کراوەوە).

ئامانجەکانت پێویستە ووردەکاری دارایی تێدا هەبێت وەکو رادەی فرۆشتنی ساڵانە، کۆی گشتی قازانجەکان، رێژەی فرۆشتن بەتاکو بەکۆ، لەهەمان کاتدا پێویستە ئامانجەکانت وردەکاری دارایی تێدا نەبێت وەکو: ژمارەی ئەو یەکانەی کە فرۆشراون، ژمارەی ئەو گرێ بەستانەی کە کراون، ژمارەی ئەو کڕیارە نوێیانە، ژمارەی ئەو راپۆرتو زانیارییانەی کە دابەش کراونو ... هتد.

هەنگاوی حەوتەم/ پەرە بدە بە چۆنیەتی دانانی بودجەی تەواو بۆ بازاڕگێڕیەکەت:

دەتوانیت بودجەی دروستوتەواو دابنێیت بە چەند شێوازێکی جودا، لەبەر ئەوەی تۆ دەتەوێت زۆر نزیك بێت لە تێچووی راستەقینەی بەرهەمەکانت، وا باشترە لەسەرەتاوە بودجەکە نزیك بێتو پاشان بتوانیت وردەکارییەکانی تری بۆ زیاد بکەییت.

یەکەم: ئەگەر تۆ پرۆژەی تایبەتی خۆت لەبەر دەستدایەو بەڕێوەی دەبەیت لەماوەی یەك ساڵ، زیاتر ویستت کۆی ئەو خەرجیانە بزانیت کە سەرفت کردووە بۆ ئەنجامدانی کرداری بازاڕگێڕی، ئەوا بەئاسانی دەتوانی خەرجی بەدەست هێنانی هەر کڕیارێك بکەیت یان کۆی مەسرەفی فرۆشتنی یەك دانەی بەرهەمەکەت ئەویش بەدابەشکردنی کۆی ساڵانەی خەرجیەکانت لەبازارسازی یان فرۆشتنەکان لەسەر ژمارەی ئەو یەکانەی کە فرۆشراون (یان ژمارەی ئەو کڕیارانەی کە بەدەستت هێناون).

دووەم: بە بەکارهێنانی تێچووی فرۆشتنی یەك دانە لە بەرهەمەکەت یان بەدەست هێنانی کڕیارێکی تازەو جاران کردنی بە ژمارەی ئەو یەکەوکڕیارانەی کە دەتەوێ بەدەستیان بهێنیت ، لێرەدا ئەنجامێکی نزیکت دەست دەکەوێت کە پێویستە بۆ پلانی ساڵی داهاتوو سەبارەت بە فرۆشتنی ژمارەی ئەو بەرهەمو کڕیارانە.

ئەنجام: ئێستا تۆ خاوەنی حەوت هەنگاوی راستەقینەی بۆ نووسینەوەی پلانێکی تەواو بۆ بازاڕگێڕییەکەت لە ماوەی یەك رۆژدا، بە راستیو ئاسانی، بێگومان تۆ تەنها پێویستیت بە سەرف کردنی هەندێ کات هەیە بۆ دیاری کردنی ئەو شێوازە راگەیاندنە گونجاوەی کە پێویستە بۆ بازاڕەکەتو دیاری کردنی تێچووی راستەقینەکەی، هەردەم هەوڵی ئەوە مەدە کە بۆ بەرەو پێش چوونی پلانەکانت بە کردارێکی ئاڵۆز ئیشەکانت جێبەجێ بکەیت، هەوڵ بدە بەردەوام بنەمای (٢٠/٨٠)تت لەبیر بێت، چونکە دەتوانی هەشتا لەسەدی ئەنجامەکانت بەدەست بهێنیت لە رێگای سەرف کردنی بیست لەسەدی تواناکانت.

ئەنجامی کۆتایی، ئاگاداربە کەسەرف کردنی کاتو دیاری کردنی بۆ نەخشەدانانی پلانە بازاڕگێرییەکەت، لەدوارۆژدا دەبێتە گرنگترین بڕوانامە کە بتوانی تۆو تیمەکەت بۆی بگەڕێنەوە لەکاتی جێبەجێکردنی پرۆژەکانتان.

کتێبی : (التسويق.. نظريات حديثة) لـ دیڤید بیبل لاپەڕە (١١-١٨).

# دەستان خۆش

لە ناخی دڵمەوە سوپاس و ڕێزو پێزانینی خۆم و ستافی گۆڤاری بڕیار پێشکەش بە هەموو ئەندامانی چاپخانەی سەردەم دەکەم، کە هەر لە ژمارە (یەك)ی بڕیارەوە وەکو هەستکردن بە لێپرسراوێتییەکی نیشتمانی ئەوپەڕی وزەو توانای خۆیان خستۆتە کارو چەندین جار شەونخوونیان کردووەو لە کاتی پشووی خۆیان گرتۆتەوە بۆ ئەوەی بڕیار بە جوانترین شێوە بگاتە دەستی خوێنەران و وەکو گۆڤارێکی خۆشەویستی خۆیان نازو خۆشەویستی تایبەتیان داوەتێ.

ئەو کارەشیان گوزارش لە بڵندی تێگەیشتن و خۆشەویستییان بۆ ئەم وڵاتە دەکات و ئەوە دەردەخات کە هاوکارێکی دڵسۆزی پێشکەوتن و گەشەپێدان و گۆڕانن.

لە ساڵیادی ڕۆشنگەری بڕیاردا بە چەپکە گوڵی پیرۆزبایی ئارەقی نێوچەوانی بەرزیان دەسڕین و دەستی ماندووبوونیان دەگوشین و سەرفرازی و بەختەوەری و سەرکەوتنیان لە خودای گەورە بە ئاوات دەخوازین، هیوادارین نموونەی بەرزی وڵاتپەروەران و دڵسۆزان هەر زۆر بێت.

هەر شاد بن..

سەرنووسەر

٢٠٠٩/٥/٥

وریا عەلی سەنگاوی



# ئۆقیانوسە شینەکان

ئەو پێشانە دەگرێتەوە کە هێشتا نەهاتوونەتە بوونەوە، هەروەها ئەو ناوچە نادیارانە دەگرێتەوە کە لە بازاردا هەن و هێشتا نەدۆزراونەتەوە، (خاڵی بازاڕە دوورەکان)، کە هێشتا دەستی خەڵکی پێ نەگەیشتووە، بۆ یەکەم جار داواکاری دەخرێتە ڕوو، وەکو ڕەنگێکی شین کە ڕەنگی سوری خوێناوی پێ نەگەیشتووە، بۆیە زۆرێك لە کۆمپانیا بازرگانییەکان لە کاتی ڕیکلام کردن بۆ شتومەکەکانیان زیاتر ڕەنگی شین بەکار دەهێنن.

نموونەشمان بۆ ئەم ئۆقیانوسە شینانە کۆمپانیای (نوفو نوردسك)ی دانیمارکییە بۆ دروستکردنی دەرمانی ئەنسولین، کە توانی ئۆقیانوسێکی شینی تازە دابهێنێت لە بازاردا، زۆرێك لەو کەسانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە ئەم دەرمانە بەکار دەهێنن.

ئەم کۆمپانیایە بەرهەمە تازەکەی خۆی پێشکەش کرد بە ناوی (قەڵەمی نوفو) بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرە، کە چارەسەرێکی باش بوو بۆ ئەم نەخۆشیە لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهێنانی زۆر ئاسانە، چونکە ئەم دەرمانە لە شێوەی قەڵەمێکی بچوك دروستکراوە، کە مادەی ئەنسولینی تێدایەو زۆر ئاسان هەڵدەگیرێت لای نەخۆشەکە، هەر کاتێك ویستی دەتوانێت بە ئاسانی بە کاری بهێنێت، لە ساڵی (1999) ئەم کۆمپانیایە بە شێوازێکی زۆر پێشکەوتووتر لە ئۆقیانوسی شین ئەم دەرمانەی خستە بازارەوە کە ئەویش لەشێوەی قەڵەمێکی ئەلکترۆنیدا بوو کە زاکیرەیەکی ئەلکترۆنی لەگەڵدایە پێوانەی هەموو ئەو ژمارانە دەکات کە نەخۆشەکە بەکاری دەهێنێت بەبێ زیادو کەم بەوەش دوودڵی و خەمۆکی لە لای نەخۆش ناهێڵێت.

بەم شێوەیە ئەم کۆمپانیایە توانی سەر بکەوێت لە پێشکەشکردنی باشترین خزمەتگوزاری بەو کەسانەی کە نەخۆشی شەکرەیان هەیە، زۆر فرۆشتنی ئەم جۆرە دەرمانە لە زۆربەی بازارەکاندا بە تایبەتی لە بازارەکانی ئەوروپادا.

ئەمەش نموونەیەکی بچوك بوو لەسەر ئۆقیانوسە شینەکان.



# پەلە مەکە!!

ع.ش.شێرکۆ

لە بڕیارەکانتدا، لـە هەموو هەنگاوەکانی ژیانتـدا، لـە گەیشـتن بـە هیـواو ئـاوات‌و ئارەزووەکانت پەلە مەکە، زۆر هێمن‌و لەسـەر خۆبـە، نەکا لـە ئەنجامـی پەلەکردنێکدا تا مردن پەنجەی پەشیمانی بگەزیت!!

پەلـە مەکە، نەوەك خوانـەکا بۆ کارێکی بچـوك، بـۆ ئارەزوویەکی کاتـی ژیانی خۆت بکەی بە قوربانی!

پەلە کـردن کات کورت ناکاتـەوە، بەڵکو زۆر جـار تەمەن کورت دەکاتـەوە، وەکو ئەو شـۆفێرەی لە پێناوی ئەوەی چەند خولەکێك زووتـر بگـات، بـە بەرزتریـن خێرایـی لێ دەخورێـت‌و لە ئەنجامدا لەبـری ئەوەی زوو بگاتە جێ، گیانی خۆی لە دەست دەدات!

ئەمڕۆ تـۆ لە زەمانێکـی دژواردا دەژیت، بڕیارێکـی هەڵە ژیانت یـا دوا ڕۆژت دەخاتە مەترسییەوە!

چەنـد کەس بـۆ لەزەتێکی کاتـی، بۆ چەند چرکەیـەك هەمـوو ژیانی خۆیان لە دەسـتدا! لە کاتێکـدا ئەگـەر پەلەیان نەکردایـە، دەیان توانی ئەو لەزەتەش دەستەبەر بکەن، بێ ئەوەی ژیان لە دەست بدەن‌و لە هەموو خۆشییەکانی بێبەش بن!

چەنـد جـار قوتابییەك گـزی دەکات لە وانەیەکدا بۆ ئەوەی نمرەیەکی باش بەدەست بهێنێـت، بەڵام لە ئەنجامدا کارەکەی ئاشـکرا دەبێـت‌و وێڕای شـەرمەزاری لە وانەکەشـی دەکەوێت!

کەواتە پێش ئەوەی کارێك ئەنجام بدەین، با لە هەموو لاکانیەوە سـەرنجی بدەین،و بیر لە ئەنجامەکانی بکەینەوە!

با بڕیارەکانمان کتوپڕو بێ بیرکردنەوە نەبن، چونکە لە دواییدا پەشیمانی سودێکی نابێت.

بۆ زیاتـر ڕوونکردنەوەی ئەم مەبەسـتە سەرنج دەدەینە ئەم ڕووداوە:

(نادر شا) کە بە یەکێك لە پاشا گەورەکانی ئێـران دەژمێردرێـت‌و چەندیـن ناوچـەی خستبووە ژێر دەسـەڵاتی خۆیەوە، ڕۆژێك بۆ گەشتوگوزار سەردانی باکوری ئێرانی کرد، لە ناکاو لە گەشتەکەیدا کەسێکی نادیار بە تیرێك شانی (نادر شـا)ی پێکا! هەندێك لە سەربازو دەسـت‌و پێوەندەکانـی وایان تـێ گەیاند کە ئـەوەی تیرەکەی بۆ هاویشـت کوڕەکەی خۆی (ڕەزا قولـی میرزا) بوو، بەمەبەسـتی ئەوەی باوکی خۆی تیرۆر بکات.

(نادرشـا) پێـش ئـەوەی لە مەسـەلەکە بکۆڵێتەوە یەکسـەر فەرمانیدا بە هەڵکۆڵینی چاوی کوڕەکـەی خۆی! دەسـت‌و پێوەندیش خێرا فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد!

دواتـر بۆی دەرکـەوت کـە کوڕەکەی بێ تاوان بووەو ئـەو کارەش پیلانێك بووە بۆ لە ناو بردنی!!

لێـرەدا جارێکـی تـر بڕیارێکـی خێرای دەرکرد، کە ترسـناکییەکەی لە بڕیاری یەکەم کەمتر نەبوو، بڕیاری دا کە یەك کیلۆ گرام لە چاوی سەربازو ئەفسەرەکانی هەڵبکۆڵێت!

کاتێك سەربازو ئەفسـەرەکان زانییان کە ئەم فەرمانەیان بەسـەردا جێبەجێ دەکرێت، لە هەمان شـەودا، هەڵیان کوتایە سـەری‌و بە خەنجەر پارچە پارچەیان کردو کوشتیان!

(نادرشـا) یەکێك بـوو لـە بەهێزترین‌و سـەرکەوتووترین پاشـاکانی ئێران، کاتێك بە هێمنی بڕیارەکانی دەردەکرد، توانی بگاتە وڵاتی هیند، بەڵام کاتێك بە خێرایی‌و بێ بیرکردنەوە بڕیاری دا، دوو بڕیاری زۆر ترسـناکی دەرکرد، لـە یەکێکیاندا چـاوی کوڕەکـەی کوێر کرد، لەوەی تریاندا خۆی لە دەست دا!!

٥. بۆ چاککردنی ژیانت پەلە مەکەو ئارام بگرە:

ئێمەی مرۆڤ ـ هەموومان ـ لە ژیاندا ڕێگەی تایبەت بە خۆمانمان هەیە، بۆ گەیشتن بە خۆشبەختیو کامەرانیش پێویستە ڕێگەیەکی جیاواز لە کەسانی دیکە بگرینە بەر، بۆیە خۆت بەراورد مەکە بە کەسانی دیکەو نەتەوێت ئەو ڕێگەیەی کە کەسانی دیکە بە سەد ساڵ بڕیویانە تۆ بە یەك شەو بیبڕیتو پێی بگەیت، لە بیرت بێت کە شیفاو چاکبوونەوە بە یەك شەو دەست ناکەوێت، ئای کە چەند ساتەوەختی دەردناكو بەسوێو ئازاریش لە میانەی شیفاو چاکبوونەوەدا چاوەڕوانیت دەکەن، کەوابوو بە خۆڕاگریو ئارامگرتنو لەسەرخۆیی کۆڵو باری کۆسپو گرفتەکانی ژیانت هەڵگرەو لا ببەو لە ڕێگەی گۆڕانکاریو ئاڵوگۆڕکردن لە ژیانتدا لە سەرخۆو هێدی هێدی هەنگاو هەڵگرن.

٦. لە هەر بوارێکدا تواناو لێهاتوویی خۆت نیشان بدە:

بۆ دەربڕینو نیشاندانی لێهاتووییو کارامەیی خۆت چەند ڕێگەیەك دەست بخە، ئەگەر وا هەست دەکەیت کە کانی لێهاتووییو کارامەییو داهێنانکاریت وشکی کردووە، ئەوا پێویستت بە دۆستو هاوەڵێکی چارەسازە تاوەکو بزانیت کە چۆنو بە چ هۆیەکەوە وەستاوە یاخود کەبتو سەرکوت کراوە؟ یان بزانە کە چ شتێك بەردەم ڕۆیشتنی لێهاتووییو ئافراندنو داهێنانکاریتی گرتووە؟

هەموومان لە ناخماندا بەشوێن کەماڵدا دەگەڕێینو لە کاتی گەیشتن بە کەماڵیشدا هەمیشەو بەردەوام لۆمەو سەر زەنشتی خۆمان دەکەینو بە ئەم کارەشمان تامەزرۆییمان بۆ فێربوونی شتە نوێو تازەکان لەناو دەچێت.

٧. بۆ بەهێزکردنی لێهاتووییمان پێویستمان بە کەمێك شادیو گەڕانە بەدوای ڕووداوەکاندا:

بۆ ئەم کارەش بچۆ بۆ پۆلەکانی وانە هونەرییەکانو هۆڵەکانی لەش جوانیو هونەرەکانی بەرگری، یاخود پارچە شیعرێك یان کورتە چیرۆکێك بنووسە، یان خۆت سەرقاڵو سەرگەرم بکە بە کاری پەیکەرسازیو سیرامیکەوە.

لەو سۆنگەیەوە کە لێهاتووییو داهێنانکاری لە ڕێگەی جیاوازەوە دەردەبڕدرێت، ئەوا تەنانەت دەتوانرێت ئەم لێهاتووییە لە ڕێگەی ئەنجامدانی کارە ڕۆژانەییەکانی وەك ڕازاندنەوەی ماڵ یان شێوازی جلو بەرگ پۆشینو چێشت لێنانەوە نیشان بدرێت.

سەرچاوە/ گۆڤاری: تدبیر زندگی ـ ژمارە: ١

# پارەیەکی لولکراو!!

و/ درەخشان بەهادین

وتاربێژێکی ناودار لە کۆڕێکدا کە دوو سەد کەس تێیدا ئامادە بوون، بڕە پارەیەکی لە گیرفانی دەرهێناو پرسی: چ کەسێك حەز دەکات ئەو پارەیە بۆ ئەو بێت؟ ئامادەبووان هەموویان دەستیان هەڵبڕی.

وتاربێژەکە: زۆر باشە، من ئەم پارەیە ئەدەم بە یەکێك لە ئێوە، بەڵام بەر لەوە دەمەوێت کارێك بکەم، دواتر لە بەرامبەر نیگای ئەبڵەق بووی ئامادەبووان، پارەکەی لول کردو پرسی: چ کەسێك هێشتا حەز دەکات ئەم پارەیە هی ئەو بێت؟

دیسان هەموو ئامادەبووان دەستیان بەرز کردەوە، ئەم جارە وتار بێژەکە پارە لول کراوەکەی خستە سەر زەویو چەند جارێك پێی بەسەرا هێنا، پاشان پارەکەی هەڵگرتو پرسی: باشە ئێستا چ کەسێك ئامادەیە ببێتە خاوەنی ئەم پارەیە؟

دیسان هەموو دەستیان هەڵبڕی، وتاربێژەکە وتی: لەگەڵ هەموو ئەو بەڵایانەی کە من بەسەر ئەو پارەیەدا هێنام، لە بەهای ئەو پارەیە هیچ کەم نەبوویەوەو هەمووتان دەتانەوێو حەز دەکەن ببنە خاوەنی.

لە ژیانی واقیعیشدا هەر بەو جۆرەیە، ئێمە لە زۆر بواردا بەو بڕیارانەی کە ئەیدەین لەگەڵ ئەو گرفتانەی کە ڕووبەڕوو دەبینەوە، دەچەمێینەوە، لول ئەبین، تەپو تۆزاوی دەبینو هەست دەکەین کە چی تر تۆز ڤاڵێك ئەرزشمان نییە، بەڵام بەو جۆرە نییەو بە چاو پۆشین لەوەی کە چ بەڵایەکمان بەسەردا هاتووە، هەرگیز بەهای خۆمان لە دەست نادەینو هێشتا بۆ کەسانێك کە خۆشیان دەوێین، کەسێکی بە نرخین.



د. سليمان على

# چۆن ئایندەت دروست دەکەیت؟

سەرەتا بۆ دروستکردنی ئاییندەت، دەبێت ئەم کارانە ئەنجام بدەیت: یەکەم: دیاریکردنی ئامانجەکەت:

دەبێت ئامانجەکەت رون‌و دیاریکراو بێت، لەگەڵ توانا، ئامادەسازی، حەزو ئارەزووەکانتدا بگونجێت.

لەوانەیە بپرسیت: بۆچی ئامانجەکەم دیاری بکەم؟

لەبەر ئەوەی کەسێك لەژیانیدا ئامانجی نەبێت، وەك کەشتی بێ چارۆکە وایە، شەپۆلەکان جارێك بەلای راست‌و جارێك بەلای چەپدا دەیبەن.

دڵنیام دەڵێیت: لاریم لەم وتەیەت نییە، بەڵام —بەشێوازێکی راست‌و دروست، بێ ئەوەی لەئایندەدا پەنجەی پەشیمانی بگەزم، بێ ئەوەی رەنجی شەوان‌و رۆژان،ساڵان‌و مانگانم ببێتە تۆزی بەر با— چۆن بتوانم ئامانجەکەم لەژیانمدا دیاریی بکەم؟

سەبارەت بەم پرسیارەت، دەبێت ئەم هەنگاوانە بنێیت:-

١- نابێت راو بۆچوونی دایك‌و باوکت، یان ئەو خزم‌و خوێش‌و دۆست‌و هاوەڵانەت کە چاکەی تۆیان دەوێت‌و لە توانا‌و ئارەزووەکانی تۆ شارەزا نین، کارت تێبکەن.

٢- دەبێت بزانیت، کەسەکان دوو چەشنن:

أ- چەشنێکیان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی‌و بەدەمەوەچوون‌و یارمەتیدانیاندا خۆشییان دێ، نموونەی ئەمە وەك: پارێزەر، پزیشك، رۆژنامە نووس، پۆلیس... هەروەها ئەو پیشانەی پەیوەندی راستەوخۆیان بە تاکەکانی کۆمەڵگەوە هەیە.

ب- چەشنەکەی دیکەیان خۆشییان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ مرۆڤدا نایەت، بەڵکو لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ئامێرو نەخشەو ئەو جۆرە بابەتانەدا خۆشییان دێ، نموونەی ئەمە وەك: ئەندازیار، بەرنامەسازی کۆمپیوتەر، تەکنیککار،.... هتد.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە چەشنێکیان چاك‌و ئەوی دیکەیان خراپ بێت، بەڵکو ئەوە حەزو ئارەزووی کەسەکانە.

لەسەر تۆ پێویستە چەشنەکەی خۆت دیاری بکەیت، هەتا دیاریکردنی بوارە زانستی‌و پیشەییەکەت لەلا ئاسان بێت.

٣- دەبێت بەرەو ئایندەت بچیت. واتە گەر حەز دەکەیت ببیتە پارێزەر، ئەوا هەفتەیەکی تەواو بچۆرە نوسینگەی پارێزەرێکەوە، تا بە چاوی دڵ‌وسەر بارودۆخەکە ببینی، ئاخۆ لەم بوارەدا خۆت دەبینیتەوە یان تەنها ئارەزوویەکی ناراستەو ساڵانێکی دوورو درێژی ژیانی خۆتی تیا بە فیرۆ دەدەیت؟

ئەمەی سەرەوە بەسەر پیشەکانی دیکەدا دەچەسپێت، ئیدی هەروا دەبێت تا ئەو کاتەی خۆت لە کارێکدا دەبینیتەوە، هەم خۆشت دەوێت‌و هەم چێژی لێ وەردەگریت.

دووەم: ئەو ئاستەنگانەی ئایندەت دەروخێنن: گەر ئامانجەکەت بە روونی دیاری نەکرد، ئەوا چەندان ئاستەنگ‌و بەربەستت دێنە رێ، کە ئایندەت دەروخێنن‌و رێگری لە نێوان خۆت‌و بەدیهێنانی خواست‌و مەبەستەکانتدا دەکەن. لەو ئاستەنگانەش:

١- بروبیان‌و هێنانەوە بەرامبەر بارودۆخ‌و دژواری ژیان، جا پاڵی لێ بدەیتەوە، خۆت بدەیت بەدەستەوەو هەوڵی دەربازبوون‌و زاڵبوون بەسەر ئاستەنگەکانتدا نەدەیت، ئەوجا ژیانت بێ ئەوەی شتێك لە ئامانجەکانت تیا هێنابێتە دی کۆتایی دێت، بەهۆی وابەستە بوونت بەم بارودخە خەیاڵاویانەوە، چونکە ئەوە خۆتی بارودۆخەکان دروست دەکەیت‌و دەیهێنیتە کایەوە نەك خودی بارودۆخەکان.

دەبێت چاوت لە دەستی دەوروبەر نەبێت، وەك زەرناقووتە نەبیت کە هەر بەتەمای دەراوی دەمی دایکە چۆلەکەو باوکە چۆلەکەیە، دەبێت رەنج بدەیت تا گەنجت دەست بکەوێت.

٢- بەکارهێنانی ئەو وتە روخێەرانەی نرخ‌و بەهاو توانا‌و وزەی خۆتیان پێ دادەبەزێنیت، وەك ئەوەی بڵێیت: من تێکشکاوم، من دۆراوم.. سەرکەوتن لەم کارە یا لەم بوارە لە من ناوەشێتەوە یان بڵێیت: من زرنگ‌و زیرەك نیم، گەندەڵی‌و تەمەڵیم لە باوو باپیرانەوە بۆ ماوەتەوە، یان من وەك کەسانی دیکە ئاشنا‌و ناسیاوی بەر پرسم نییە، یان شانسم نییەو ناوچەوانەکەم نایهێنێ... ئەم وتانە بەسن بۆ رووخانی ناخی تۆ، بۆ تێکدانی خودی تۆ، بۆ وازهێنان لە هەوڵی گەیشتنی ئامانجەکانی تۆ، ئەوساش ژیانی ئێستا‌و ئایندەی تۆ دوایی دێت. دەزانیت بۆ سەرکەوتوو سەر دەکەوێت؟ شکاویش تێك دەشکێت؟ یەکەمیان: دەسکەوتەکانی سەرکەوتن‌و دووەمیشیان ئاکامەکانی شکست بە هزرو هۆشی خۆیدا دەهێنێت.

دواجار گوێی دڵت بۆ ئەم ئامۆژگارییەم را بگرە: گەر بە پێدا گری‌و خۆشەویستی‌و ئارەزووی راستەقینە، ئامانجەکەت هەڵ نەبژێریت، ئەوا لات روون بێت ژیان خۆی ئەوەی پێت ناخۆشە بۆت هەڵدەبژێرێت‌و ئایندەیەکی نەخوازراوت بۆ دروست دەکات، جا خۆت سەر پشکیت‌و بریار بریاری خۆتە.. چونکە لە دیاریکردنی ئایندەتدا هەروەها ئەو ژیانەی خوازیاریت بیبەیتە سەر هەر خۆت بریار بە دەستیت، بشزانە خوا نات گۆرێ تا ئەوەی لە ناختدا چەسپاندووە نەیگۆڕیت.

# هۆیەکانی لەبیرچوونەوەو چارەسەرکردنی



پەیمان بەرزنجی

(ئەوەی مرۆڤ هۆشیار دەکات شتێك نییە کە دەیخوێنێ، بەڵکو شتێکە لە بیری دەمێنێت). فرانسیس بیکن.

سروشتییە مرۆڤ شتی لە بیر بچێتەوە، زۆر لە بیرچوونەوە سوودی بۆ مرۆڤ هەیە کاتێك مرۆڤ تووشی کارەساتەکان دەبێت وەك مردنی ئازیزان و خۆشەویستەکان ئەگەر لە بیرچوونەوە نەبوایە تووشی نارەحەتییەکی زۆر دەبوو، بەڵام ئەم جۆرە لە بیرچونەوەیە خەڵاتێکی مەزنە بۆ مرۆڤ جێی خۆیەتی سوپاسی خوداوەند بکەین لەسەر ئەو بەخششە. جا قوتابی خۆشەویست هەروەك کریستان چۆڤی دەڵێت: (مرۆڤی سەرکەوتوو وەك درێل کار دەکات، بە شێوەیەك کە هەموو هێزی خۆی لەسەر یەك خاڵدا کۆدەکاتەوە)، لێهاتوویی و بلیمەتی ١٪ بەهرەیەو لە ٩٩٪ کۆشش و هەوڵدانی مرۆڤە.

ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی لە بیرچوون:

١- گوناهو تاوان: ئەگەر دەتەوێت بیرت باش بێت، خۆت لە تاوان بپارێزە.

زانایەکەك دەڵێت: (وا دەبینم کە هەر زانیاریەك فێری بوویت لە بیر ناچێتەوە ئەگەر بەهۆی تاوانەوە نە بێت).

٢- کۆن بوونی زانیارییەکان و وازهێنان لە دووبارە کردنەوەی ئەو زانیاریانەی کە خوێندوتە.

٣- خوێندنەوەی هەر مادەیەك لە کاتی ماندووبووندا.

٤- بیر نەکردنەوەو تەرکیز نەکردن و بەکار نەهێنانی مێشك.

٥- متمانە نەبوون بە خودی خۆت.

٦- هەندێ جار قوتابی تووشی هەندێ نەخۆشی دەبێت وەکو نەخۆشی دەروونی، یان ترس، دڵە راوکێ، شێوان، بێ ئارامی.

٧- گوێ لە خۆ نەگرتن یان نە نوسینەوەی ئەو شتانەی کە دەیخوێنیت.

٨- خوێندن لە شوێنی نزم یان بە پاڵدانەوەو سەر سیسەم یان خەو هاتن و خەیاڵ کردن، هۆکارن بۆ لە بیرچونەوە.

٩- خوێندنی دوورودرێژ بێ پشوودان دەبێتە هۆی ماندوو بوونی مێشك.

١٠- دابەش نەکردنی کات بە شێوەیەکی رێکوپێك و نەبوونی پلان و نەخشە.

١١- لەبەرکردنی چەند بابەتێکی جیاواز لە یەکتر نزیك بەسەر یەکەوە وا دەکات بابەتەکان تێکەڵ بن و لە بیر بچن.

١٢- لا نەبردنی کۆسپەکانی لە بیرکردن بە تایبەتی زۆر خۆری، زۆر خەوتن، تەممەڵی و تەوەزەلی.

١٣- نەبوونی حەزو ئارەزوو، نەبوونی ئاگای تەواو لە کاتی خوێندنی وانەکاندا.

١٤- ماندو کردنی مێشك بە لایەنی سێکس: خاوەنی ئەم جۆرە کارانە زۆربەی جار مێشك و دەماغی ماندوو دەبێت و وردبینی بۆ زانیاری کەم دەبێت.

بەهێزکردنی مێشك و چارەسەرکردنی لە بیرچوون:

١- زۆر لە توێژینەکان ئەوەیان سەلماندووە کە مرۆڤ ناتوانێت لە یەك کاتدا دوو چالاکی ئەنجام بگەیەنێت، پێویستە تۆ لە کاتی خوێندن و لەبەرکردندا هەموو تەرکیزی بخەیتە سەرو خەیاڵت لای هیچ کارێکی تر نەبێت.

٢- بۆ بەهێزکردنی مێشك پێویستە گرنگی بە شتی بچوك وەك ساتەکان و خولەکەکان بدەین؟!

٣- دروستکردنی حەزو ئارەزوو متمانە بوون بە خودی خۆت.

٤- پێدا چوونەوە پاش (٣٠) خولەك لەبەرکردن و خوێندن دەبێتە هۆی بە بیر هێنانەوە.

٥- خۆپاراستن لە گوناه.

٦- بەکارهێنانی زیاتر لە یەك هەستەوەر دەبێتە هۆی چەسپاندن وەك چاوو گوێ و زمان.

٧- نەهێشتنی هەراسانی و بێزار بوون هەر کاتێك تووشی ئەم حاڵەتە بوویت، پشوو بدە.

٨- هەر کاتێك زانیارییەکت لە بیرچوو، بیری لێ بکەرەوەو مەگەڕێرەوە سەر کتێبەکە، چونکە بە ئاسانی زانیاری دەربهێنی، بە ئاسانیش لە بیری دەکەیت، واتە ماندوو کردنی خۆت بۆ بە دەستهێنانی زانیاری و بە بیر هێنانەوەت.

٩- هەناسەدان بە لوت، بەڵام هەناسە دانەوە بە دەم، کاتێك بە قوڵی هەناسە هەڵدەکێشی ٨١٪ تەرکیز زیاد دەکات، بە تایبەتی (٤- ٢- ٨) واتە ٤ جوڵە بە لوت، ٦ جوڵە بووەستە، ٨ جوڵەش هەناسە بدەرەوە.

١٠- زەردەخەنە دڵ و دەروون ئارام و ئاسوودە دەکات، مێشك بەهێز دەکات، کەواتە لە کاتی لەبەرکردن و خوێندن خۆت مۆن و گرژو تورە مەکە.

١١- بەستنەوەی هەر زانیارییەك بە شتێکەوە تا لە بیری نەکەیت.

١٢- پشوودان و نوستن بە تایبەتی خەوی پێش نیوەڕوان.

١٣- خواردنی هەندێك شت کە مێشك بەهێز دەکات، وەکو گوێز، مێوژ، مۆز، سێو، خورما، گێزەر، قەیسی،... هەر یەك لەم خواردنانە پێویستە بە شێوەیەکی کەم رۆژانە جۆرێك یان دوو جۆر بخۆیت، نەك بەشێوەیەکی زۆر خۆرانەو بێ بەرنامە.

١٤- خواردنی بە یانیان تەرکیز زیاد دەکات.

١٥- نوێژ کردن لە پشوودانە گرنگەکانە لە ژیانی مرۆڤدا.

١٦- پرسیار کردن لە خۆت تەرکیز زیاد دەکات، وەکو (چۆن؟ بۆچی؟ کەی؟ لە کوێ؟).

١٧- خواردنی شیری سارد مێشکی مرۆڤ بەهێز دەکات، پیاوێك چووە لای زانایەك پێی وت: من شتم لە بیر دەچێت، زاناکە وتی: شیری سارد بخۆ، چونکە شیر مێشك بەهێز دەکات و وریایی بە دڵ دەبەخشێت.

١٨- خواردنی شیرینی سروشتی، مێشکی مرۆڤ رۆژانە پێویستی بە (١٥٠) گرام شەکر هەیە تا بەشێوەیەکی ئاسایی کار بکات، جا هەر کات هەستت بە ماندووی کرد یان خەوت هات، شیرینی سروشتی بخۆ بۆ وێنە خورما، مرۆڤ هەر چەندە زیاتر ماندوو بێت رێژەی شەکر لە لەشیدا کەم دەبێت.

١٩- چۆن لە خۆت تێبگەی هەر ئەوەش دێتە دی، ئەگەر زیرەکترین و بە تواناترین مرۆڤ بیت، بەڵام بۆچوونی خراپت هەبێت، ئەوا دوای ماوەیەك وەکو مرۆڤی دەبەنگ دەبیت، کەواتە هەمیشە گەشبین بە.

٢٠- هەر شتێك لەبەر بکەی دەبێ جوان تێی بگەی پاشان لەبەری کەیت، کاتی گونجاویش بۆ لەبەرکردنەکە دابنێ، وەکو بەیانیان زوو، هەروەها پێش نووستن ئەو بابەتانەی لەبەرت کردووە دووبارەی بکەرەوە.

٢١- پشت بەستن بە خودا لە بیر نەکەین، دەستەکانمان بەرەو ئاسمان بەرز بکەینەوەو لێی بپارێینەوە کە یارمەتیمان بدات و بیرمان بەهێز بکات.

# چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەڕێز خاوەن ئیمتیاز



ئەندازیار (مەسعود رۆژبەیانی)

بڕیار: سەرەتا حەز دەکەین وەك خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری بڕیار خۆت بە خوێنەران بناسێنیت؟

خاوەن ئیمتیاز:

* ناوم (مەسعود تاهیر یونس رۆژ بەیانی)یە، کۆلێژی ئەندازیاری شارستانیم تەواو کردووە لە ساڵی (١٩٨١) لە زانکۆی بەغداد.

* خاوەنی کۆمپانیای رەسەن بۆ بەڵێندەرایەتی/ RSN بۆ پیشەسازیی و بازرگانی.

* دانیشتووی شاری هەولێرم، ئەندامی دەستەی کارگێڕی یەکێتی بەڵێندەرانی کوردستان و جێگری سەرۆکی یەکێتی بەڵێندەرانی کوردستان- لقی هەولێرم.

بڕیار: چۆن بیرت لە بڕیار کردەوە؟ بۆچی بڕیارت هەڵبژارد؟

خاوەن ئیمتیاز: من زۆر بەخێرایی گۆڤارو رۆژنامە زۆر دەخوێنمەوە، هەموویان لێك نزیکن لە ناوەرۆکدا، وەکو سیاسەت، رەخنە، ئەدەب، چاوپێکەوتن...... هتد.

لە مێژە حەزدەکەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان بە زمانی کوردی خۆمان هۆکارەکانی پێشکەوتنی تاك و کۆمەڵ بڵاو بکەینەوە وەکو پێشکەوتن لە بوارە جیاجیاکانی بەڕێوەبردن لە ناو ماڵەوە تا پانتایی خاکی نیشتیمان، تێگەیشتن لە پەرەپێدانی مرۆیی، کە تواناکانی خەڵك بەهێز دەکات و رۆڵی راستەقینەی مرۆڤ لە پەرەپێدانی گۆی زەوی دەردەخات، هەروەها پەروەردە، بە تایبەت پەروەردەی منداڵ و هەرزەکار کە نەوەی دوارۆژن، فێرکردنی شێوازی هەڵسوکەوتی ئەرێنی و راستکردنەوەی پەیوەندییەکان لەگەڵ یەکتری و دایك و باوك و مامۆستاو قوتابخانەو گۆڕینی هەڵسوکەوتی خەڵك لە پەیوەندی سلبی بۆ ئیجابی و زانینی قەدری کات و تەمەنی مرۆڤ، حەز لە رەخنە گرتن ناکەم، لە جیاتی ئەوە پێشکەش بکە.

بڕیار: دوای ئەوەی بڕیار کەلێنێکی گەورەی لە رۆژنامەوانی کوردیدا پڕ کردەوەو وەك یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی لە دڵی خوێنەری کوردا جێی خۆی کردەوە، بەڕێزت هەست بەچی دەکەیت؟

خاوەن ئیمتیاز: هەست بە خۆشییەکی زۆر دەکەم... هەست دەکەم کەلێنێکی بچووکمان پڕ کردۆتەوە لە خزمەت کردنی میللەتەکەم، هەست دەکەم هەموومان زۆر شتمان پێ دەکرێت ئەگەر تواناو کاتەکانمان بخەینە گەڕ.

بڕیار: تا ئێستا (١٢) ژمارەی گۆڤاری بڕیار دەرچووە، جەنابت تەنها کەس بوویت کە یارمەتی ئەم گۆڤارەت داوە، بێ ئەوەی هیچ شتێك فەرز بکەیت بە سەر سەرنوسەرو ستافی بڕیاردا، ئەم کارەش لە خودی بڕیاردا کارێکی زۆر گەورە بوو، وایکرد کە هەموو کەسێك بڕیار بە گۆڤاری خۆی بزانێت و لە ناخەوە خۆشی بوێت!

کەواتە چۆن بەبێ هیچ سنور بەند کردنێك ئامادە بوویت دەعمی ئەم گۆڤارە بکەیت، بۆچی؟

خاوەن ئیمتیاز: زۆرم حەز دەکرد گۆڤارێکی لەو چەشنە دەرکەین، هەر چۆنێك بێت کە دەرچوو زۆر زۆر بە دڵم بوو، چاوەڕوانی ژمارەی دووەم و سێیەم بووم، لە لام باشترو خۆشەویستر بوو، تا ژمارە دوانزە هەمووی نوێ بوونەوە بوو، بەرەو پێشەوە چوون بوو، بڕیار لە لام ئازیز تر دەبوو، جا چۆن سنور بەندی بڕیار بکەم و دەعمی نەکەم.

بڕیار: زۆربەی دەوڵەمەندان و پیاوانی کار تەنها بیر لەوەبەرهێنانی ماددی دەکەنەوە، چۆن بوو جەنابت بیرت لە وەها پرۆژەیەك کردەوە؟

خاوەن ئیمتیاز: هەستم کرد تەنها مادده گۆڕان لە ناخمدا دروست ناکات، ساڵ بە ساڵ هەر چەند مادده کۆ بکەیتەوە، زیادە خۆشییەك روو نادات، بۆیە گەڕام بە دوای رێگایەکی تر بۆ دڵ خۆشی کردن و بەختەوەری، ئەویش رێگەی بڕیار بوو.

بڕیار: ئامۆژگاریت چییە بۆ پیاوانی کار بۆ ئەوەی بیرێك لە وەبەرهێنان بکەنەوە لە بواری داهاتە مرۆییەکاندا (الموارد البشریه)؟

خاوەن ئیمتیاز: ئامۆژگاریم ئەوەیە تا تەمەن ماوە شتێك بکەین، دوای مردنمان بمێنێتەوە، نەوەکانمان بیلێنەوە، چونکە پارە تەنها ناخۆشی دروست دەکات، لە کاتی دابەشکردنی میراتەکاندا.

بڕیار: هیچ پرۆژەیەکی نوێی هاوشێوەی بڕیارتان لەبەرنامەدایە؟

بەڵێ ئێستا بە نیازی دانانی پەیمانگایەك یان سەنتەرێك بۆ (ئامادەکردن و راهێنان) لە بواری بەڕێوەبردن و پەرەپێدانی مرۆیی و ژمێریاری و شتی تر بۆ پەرەپێدانی توانای خەڵك و فەرمانبەران و ستافی دامەزراوەکان و کۆمپانیاکان.

بڕیار: دوا وتەت بۆ خوێنەرانی بڕیار بە تایبەتی و لاوان بە گشتی؟

خاوەن ئیمتیاز: بەشداری پەرەپێدانی (بڕیار) بکەن، چونکە گۆڤاری خۆتانە، بە وردی بیخوێننەوە، بیکەنە دیاری، رەخنەی بنیاتنەری لێ بگرن.

ئەو شتانەی دەیخوێننەوە لە بڕیار بیکەنە کردار، بە یەکتر خۆشویستن، نیشتمان خۆشەویستی، رێزی کات بگرن و کارەکانتان بە پێی پلان ئەنجام بدەن، رێزی گەورە بگرن، بە زەییتان بە بچووکدا بێتەوە، راستگۆ بن، دەست پاك بن، تەباو کۆك بن لە نێوان یەکتریدا، خاوەن هەموو رەوشتێکی باش بن، لە هەموو شتێکی باش تا بگەینە ئاستی دەوڵەتانی پێشکەوتوو، رێگر بن لە هەموو هەڵسوکەوت و کردەوەیەکی خراپ، کە زیان بە ئایین و گەل و نیشتمانمان دەگەیەنێت.

# لەگەڵ سەرنووسەردا




**بڕیار:** بۆچی بڕیاتان هەڵبژراد؟ چۆن بیرتان لەم بوارە کردەوە؟

دوای گەڕانەوەم بۆ کوردستان لە دوای (١٢) ساڵ، ئاواتەخوازبووم بتوانم کەلێنێك پڕ بکەمەوەو دەستم هەبێت لە ئاوەدانکردنەوەو گەشەپێدان‌و سەرکەوتنی وڵاتەکەمدا، هەمیشە لە خولیای ئەوەدا دەژیام کە وڵاتەکەی منیش دەکرێت بگاتە ئاستی وڵاتانی پێشکەوتوو ئەگەر بەدڵسۆزیی خزمەت بکەین، بۆ ئەم مەبەستەش تێڕوانینی تایبەتی خۆم هەبوو، من لام وایە سەرەتای هەموو گۆڕان‌و پێشکەوتنێك دەبێت سەرەتا لە خودی مرۆڤەوە دەست پێ بکات، بۆیە گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە گەورەترین پڕۆژە کە خزمەت بە کوردستان دەکات‌و ڕێ خۆش دەکات بۆ گۆڕان‌و گەشەپێدان، سەرەتا بنیاتنانەوەو نۆژەنکردنەوەی تاکی کوردو بە کارگێڕی کردنی ژیان‌و دام‌و دەزگاکانی وڵاتە، ئالێرەوە گۆڕان ئاراستەی سروشتی خۆی وەردەگرێت.

**بڕیار:** کێ یەکەمین هاوکارت بوو پڕۆژەیەدا؟

دوای لێکۆڵینەوەیەکی تەواوی پڕۆژەکەو دانانی پلانی تەواو، پڕۆژەکە پێویستی بە دەعمی ماددی هەبوو، بەڵام وەك دەزانن بڕیار گۆڤارێکی ئاسایی نییەو ناکرێت پاشکۆی کەسێك یا لایەنێك بێت، بەداخەوە لەم وڵاتەی ئێمەشدا ئاستی ڕۆشنبیری نەتەوەیی ئەوەندە لاوازە، کە پڕۆژەی نەتەوەیی سەربەخۆ، کەس باوەڕی پێ نییە!! کەس ڕازی نییە بێ بەرامبەر یارمەتی هیچ پڕۆژەیەك بدات، بیرکردنەوە لەو پڕۆژانەی کە سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەموو گەل‌و نەتەوە بوونی نییە لای چینی دەوڵەمەندو سەرمایەدار، دەکرێت بە تیلەی چاوێکی دەسەڵات، چەندین ملیۆن دۆلار بکرێت بە خەڵاتی پڕۆژە کەسی‌و حیزبییەکان، بەڵام ئامادە نەبن (١٠٠) دۆلار بدەن بە وەها پڕۆژەیەك!

منیش دەگەڕام بەدوای کەسێکدا کە هەم لە ئاستی پڕۆژەکەدابێت‌و درك بە مەسەلەکە بکات، هەم وەك پڕۆژەیەکی نەتەوەیی بێ هیچ قەیدو مەرجێك دەعمی پڕۆژەکە بکات.

بۆ ئەم مەسەلەیە لەگەڵ برای بەڕێزمدا کاك (محمد هاشم) قسەم کردو فیکرەکەم تێگەیاند، ئەویش بەڕێز ئەندازیار (مسعود ڕۆژبەیانی) هەڵبژارد وەك گونجاوترین کەس بۆ یارمەتیدانی ئەم پڕۆژەیە، دوای دانیشتنمان لەگەڵ بەڕێزیدا دەرکەوت کە هەرسێکمان هاوڕاین‌و تەماشای یەك ئاراستە دەکەین، بەڕێزیان وەك کەسێکی دڵسۆزو هەستیار بەرامبەر گەل‌و نەتەوەو دوارۆژی ئەم وڵاتە، پەیمانی یارمەتیدانی گۆڤارەکەیدا بە هەموو توانایەکی‌و تا ئێستاش یارمەتیدەری سەرەکی بڕیار لە یەکەم ژمارەیەوە بەڕێزیانەو سوپاس بۆ خودا ئەمەش وایکرد کە گۆڤارەکە بە سەر بەخۆیی دەربچێت‌و بەسەربەخۆیی بەردەوام بێت، بۆ سەربەخۆیی تاکی کورد!

**بڕیار:** دەرچوونی یەکەمین ژمارەی بڕیار دەنگدانەوەی چۆن بوو لەسەر ئاستی کوردستان؟

دەرچوونی یەکەم ژمارەی بڕیار ڕووداوێکی گەورەبوو، وەرچەرخانێکی ناوازە بوو لە زۆر بواردا، یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی‌و گەشەپێدان لە مێژووی کورددا، جوانترین دیزاین‌و چاپ، گۆڤارێکی ئامانجدارو یەك ئاراستەو سەربەخۆ، نوێ خوازو نوێ لە خودی خۆیدا، هەموو ئەمانە وایکرد کە دەرچوونی بڕیار ڕووداوێکی نا ئاسایی‌و گرنگ بێت!

**بڕیار:** کاتێك خەڵکی چاویان بە بڕیار دەکەوێت، باوەڕ ناکەن گۆڤارەکە سەربەخۆ بێت، بەڵکو وادەزانن بودجەیەکی زۆرو ستافێکی گەورە کاری تێدا دەکات، ئەم بۆچوونە تا چ ئەندازەیەك ڕاستە؟

بەداخەوە لە کوردستاندا سەربەخۆیی بۆتە ئەفسانە، زۆرێك لە خەڵکی لە هەموو شتێکی سەربەخۆ بە گومانن، باوەڕیان بە سەربەخۆیی خۆشیان نییە، لەو باوەڕەدام ئەگەر ئێمە نەتوانین بیر لە گۆڤارێکی سەربەخۆ، کەناڵێکی سەربەخۆ، ڕێکخراوێکی سەربەخۆ بکەینەوە، زۆر ئەستەمە بیر لە وڵاتێکی سەربەخۆ بکەینەوە، بەڕای من مرۆڤ ئەگەر پشت بە توانا‌و ئیدراکی خۆی ببەستێت، دەتوانێت لە زۆر شت حاڵی بێت‌و حەقیقەتی زۆر شتی بۆ دەرکەوێت.

بڕیار سەلماندی کە خودی سەربەخۆی ئامانجدارو بە بەرنامە، دەتوانێت کارێك بکات کە بەملیۆنەها دۆلار ناکرێت!

وەکو لایەنی ماددی جگە لە یارمەتی خاوەن ئیمتیازو هەندێك ڕیکلام نەبێت، بڕیار هیچ سەرچاوەیەکی ماددی نییەو هەرکەسێکیش پارەی بەخشیووە بە ئێمە با ژمارەی چێکەکەی ئاشکرا بکات! بەڵام منیش وەکو خوێنەرێکی بڕیار کە شەوێك پەیوەندی پێوەکردم‌و ناوی خۆی ئاشکرا نەکرد دەڵێم: (کاری گەورە بە پارە ناکرێت)!

هەموو ئەو ستافەی لە بڕیاردا کاردەکەن لە ژمارەی پەنجەکانی یەك دەست تێناپەڕن، تا ئێستا خەڵاتمان نییە بۆ هیچ نووسەرێك، هیچ کەسێك لای ئێمە بۆ پارە نانووسێت!!

هیچ کەسێکیش لە ستافی گۆڤاری بڕیاردا پەیوەندی بە هیچ لایەنێکی سیاسییەوە نییەو خۆی بە موڵکی هەموو کورد دەزانێت.

دەرگای گۆڤارەکەش کراوەیە بۆ هەر کەسێك حەز دەکات لەو ڕێگایەوە خزمەت بە گەل‌و وڵاتەکەی بکات‌و کێشەمان لەگەڵ هیچ کەسێکدا نییەو هەموو کەس بە دۆستی خۆمان دەزانین.

لەبەرژەوەندی ئێمەش نییە کڵاو لەسەر خوێنەرانمان بنێین، چونکە ئێمە عەقڵی خوێنەرانمان بەلاوە سەنگینەو ئەوەندە خەڵك بە ساویلکە تەماشا ناکەین، کە بە ڕووکەش شتێك بین‌و لە ناخەوە شتێکی تر، گۆڤارەکەش بە شایەدی هەموو خوێنەران، دەزانن کە تا ئێستا خزمەتی بە کێ کردووە، بڕیار موڵکی هەموو کوردێکەو هەموو کوردێك بۆی هەیە بە هی خۆی بزانێت‌و شانازی پێوە بکات.

*ئەم چاوپێکەوتنە درێژەی هەیە، هەر پرسیارو سەرنجێکت هەیە دەتوانی ئاراستەی گۆڤارەکەی بکەیت لە ڕێگای ئیمەیڵەوە، تا بەڕێز سەرنووسەر وەڵامیان بداتەوە..*

مرۆڤ بەسروشتی خۆی کۆمەڵایەتییەو ناتوانێت دوور لە مرۆڤو دەوروبەر بە کەنارگیری بژی،ژیان و گوزەران و چالاکییە جۆر بە جۆرەکانی مرۆڤیش وا دەکات کە پەیوەندی هەبێت بە مرۆڤان و دەوروبەرییەوەو کۆمەڵێک پەیوەندی مرۆیی دروست بکات.

سەرکەوتنی مرۆڤیش لە پەیوەندییە مرۆیەکانیدا دەبێتە مایەی خۆشحاڵی و ئاسوودەیی و دڵنیایی و حەزکردنی دەوروبەر بە تێکەڵاوی و مامەڵە لەگەڵ کردنی و ئەمەش دەبێتە مایەی سەرکەوتنی لە ژیان و سەرجەم کارو بارەکاندا.

لێرە دا کۆمەڵێک ئەتیکێت باس دەکەین کە رەچاوکردنیان دەبێتە مایەی سەرکەوتنی پەیوەندییە مرۆییەکان:

١- خەندە: با هەمیشە رووخۆش بیت و زەردەخەنە لەسەر لێوت بێت، چونکە خەندە کلیکی کردنەوەی دەرگای دڵەکانە بێ ئەوەی هیچ مەسرەفێکی تێ بچێت، ئەنجامی زۆر باش دەبێت و زۆر کارت بۆ ئاسان دەکات.

٢- شارەزایی لە هونەری گوێگرتن داو قسە نەبرین بەو کەسەی قسەت بۆ دەکات، چونکە کاتێک قسەی پێ دەبریت ناتوانێت کۆنترۆڵی قسەکانی بکات و لە ئەنجامدا رێزت ناگرێت!

٣- هەڵبژاردنی جوانترین وشەو دەستەواژە، وەك چۆن هەنگ شیلەی جوانترین گوڵ دەمژێت، پەروەردگاریش داوا لە بەندەکانی دەکات کە بە باشترین شێوە بدوێن و رازاوەترین وتە بدرکێنن.

٤- هونەرمەندی لە هەڵبژاردنی بابەتی قسەکردنداو دوورکەوتنەوە لەو بابەتانەی کە خەڵکی پێی بێزار دەبن.

٥- هەمیشە تەرکیز بکەرە سەر لایەنە باشەکانی بەرامبەرو چاوپۆشی لە عەیبەکانی بکە، چونکە هیچ کەسێك لە ئێمە بێ ناتەواوی نییە، هەرکاتێکیش ویستت هەڵەیەك بۆ کەسێك راست بکەیتەوە بە شێوەی ناراستەوخۆو جوانترین شێوە ئاگاداری بکەرەوە، وەکو ئەوەی باسی کەسێکی بۆ بکەیت.

٦- زۆر گاڵتە مەکەو مەهێڵە گاڵتەکردن بەسەرتا زاڵ بێت، چونکە هەموو کەس ئارەزووی گاڵتەکردنی نییە، وێرای ئەوەی پێویستە کاتی گونجاو بزانیت بۆ ئەم کارەو گاڵتەکردنەکەت گاڵتەکردن نەبێت بە بەرامبەر.

٧- سرووشتی بەو سروشتی خۆت مەگۆرە، خەڵکی کەسێکیان خۆش ناوێت هەڵس و کەوتی نائاسایی بێت و تەمسیل بکات، ئەم جۆرە لەسەر دڵی خەڵکی قورسن و حەز بە تێکەڵاویکردنیان ناکرێت.

٨- خۆت بپارێزە لە زۆر بڵێی و زۆر قسەکردن، چونکە ئەم سیفەتە لای خەڵکی بێزراوەو مرۆڤەکان وەها کەسێکیان خۆش ناوێت.

٩- هەوڵ بدە هەرگیز بە خراپە باسی کەس مەکەو لە پاش ملەغەیبەتیان مەکە، چونکە ئەم کارە وێرای ئەوەی کە تاوانە بۆچوونێکی خراپ دەداتە بەرامبەر سەبارەت بەتۆ.

١٠- زۆر خۆت بەکەم بزانە، مرۆڤەکان کەسانی لووت بەرزو بە فیزیان خۆش ناوێت و کەسانی سادەو ساکار زۆر لە دڵەکاندا جێی خۆی دەکاتەوە.

١١- ئاگاداری وادەو بەڵێنەکانت بەو هەرکاتێك بەڵێنت دا یان کاتێکت دیاری کرد بەڵێنەکەت ببەرە جێ‌و لەکاتی دیاریکراودا ئامادەبە، چونکە پەیوەست بوونت بە کاتو بەڵێنەکانتەوە زیاتر لە دڵی خەڵکی دا گەورەو بەرێزت دەکەن.

١٢- بەرامبەرەکەت بە جوانترین ناو کە خۆی ئارەزووی دەکات بانگ بکەو هەرگیز ناو و ناتۆرەی ناشیرین لە کەس مەنێ، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە زۆر لە تەمەنی تۆ بچوکتر بوو.

١٣- هەرکاتێك زانیت هەڵەیەکت کردووە، خێرا داوای لێبوردن بکەو بەردەوام مەبە لەسەر هەڵەکەت.

١٤- بۆ ئەوەی بەرامبەر هەمیشە خۆشی بوێیت، هەرگیز هەستی بریندار مەکەو کەسایەتی و پلەوپایەی لەکەدار مەکەو رێز لە خۆی و بۆچوونەکانی بگرە.

١٥- کاتێك دەتەوێت کاریگەریت هەبێت لەسەر ئاکارو هەڵسوکەوتی کەسێك، وەسفی باشەی لایەنێکی ئیجابی ئەو بکە تا هەوڵ بدات ئەو بوارە زیاتر بەهێز بکات و تا بۆت دەکرێت وەسفی باشەی بکە.

١٦- کاتێك رەخنەت گرت، رەخنە لە ممارەسە یا هەڵس و کەوتێك بگرە، هەرگیز رەخنە لە کەسایەتی خاوەنی ئەو هەڵسوکەوتە مەگرە.

١٧- هونەرمەندانە رەخنە مەگرەو خۆت لە رەخنەی روخێنەرو بریندارکەر بپارێزە.

١٨- لێبوردەو دلۆڤان بەو رق و کینە لە دڵدا هەڵمەگرە.

١٩- دیاری و خەڵات هۆکارێکی گەورەیە بۆ بڵاوبوونەوەی خۆشەویستی و پەرەسەندنی.

٢٠- بەخشندە تر بە زیاتر لەوەی گومانت پێ دەبەن، و چاوەڕوانت لێ دەکەن.





# کچان و کوڕان لە نێوان ئازارو ئاواتدا

## پێش ئەوەی کەشتیەکە نوقم بێت!!

باوكان‌و دایكانی بەرێــز، پەروەردەكارانی ئازیــز، دەبێت هەموومان ئەو راســتیە بزانین كــە ئەم ســەردەمەی ئێمەی تێــدا دەژین زۆر جیاوازە لەســەردەمانی زوو، ئێســتا كۆمەڵێك هەڕەشەی زۆر بەرەو رووی گەنج‌و لاوەكانمان دەبنەوەو پێویســتە زۆر گرنگیان پێ بدەین‌و بۆ پاراستنیان بەپەرۆشەوە ئاگادارییان بین.

ئەمــرۆ چەندین هەڕەشــەیماڵوێرانكەر رووبەڕوویان دەبێتەوەو گەمارۆیان دەدات:

تلیاك‌و مادده هۆش بەرەكان خواردنەوەو مادده سەرخۆشكەرەكان، جگەرە، توندوتیژی، لادانی ئەخلاقی‌و هاوڕێی خراپ، نەخۆشــییە سێكسیەكان‌و چەندین هەڕەشەی لەم بابەتە.

ئــەوان ئەمرۆ زیاتــر لە هەمــوو كاتێك پێویستییان بە ئێمەیە، پێویستە ئاگامان لێیان بێت‌و فەرامۆشیان نەكەین، تا بەهۆی یەكێك لــەو هۆكارانەی ســەرەوە گولــزاری جوانی‌و لاوێتیــان هەڵنەپرووكــێ‌و ژیــان‌و دوارۆژییان نەكەوێتە مەترسییەوە.

پێویســتە درك بەوە بكەین، كە پەروەردە بــە تەنهــا بریتــی نییــە لــە دابینكردنــی پێداویستیەكانی ژیان‌و گوزەران.

بێ ئەوەی بزانین كوڕان‌و كچان رۆژانە چی دەكــەن‌و بەرنامەیان چییــەو هاوڕێیەتی كێ دەكەن‌و هەوادارییەكانییان چییەو سەرگەرمی چین؟!

پێویســتە ئاگــاداری ئەوە بــین‌و بزانین كاتەكانیان بەچییەوە بەســەر دەبەن، ئەركی ئێمەیــە بەشــێوەیەكی بەرنامەڕێژ بەرامبەر ئــەو هەڕەشــانە هۆشــیاریان بكەینــەوەو رێنماییان بدەینێ.

ئەمرۆ لە جیهانی جیهانگیری‌و عەولەمەدا، تادێــت بەربەســتەكان دەســڕێنەوەو جیهان لــە گوندە بچكۆلەكــەی جــاران زیاتر بچوك دەبێتــەوە، لــە رێگــای ئینتەرنێــت‌و كەناڵە ئاســمانیەكان‌و نوســراو و بڵاوكراوەكانــەوە هەموو شــتێك بێ سانســۆر پەخش دەكرێت، بەتایبــەت لەگەلانــی جیهانی ســێیەم دا كە نەگەیشــتونەتە ئەو ئاســتەی جیاوازی نێوان ئازادی‌و پاشاگەردانی‌و بەرەڵایی بزانن.و تاكە پێناسەیەك بۆ ئازادی‌و دیموكراسی سڕینەوەی سنورو بەها كۆمەڵایەتیەكانە.

زێتر ئەم كێشەیە گەورەتر دەبێتەوە.

ئەمــرۆ نەوەكانــی ئێمە، هەموو شــتێك دەبینێت، هەموو شتێك دەبیستێت.

زاڵبونی دونیای ماددەپەرستیش وای كردووە، كە هەوڵ بدات هەموو شتێك تاقی بكاتەوە، تەنها پێــوەر لەم جیهانە جەنجاڵــەدا، بۆ دیاریكردنی پلــەو پایە هەبوونــی زۆرترین ســامان‌و بوونی ماددی‌و لەززەت‌و خۆشییەكانی دونیایە.

پێشــەنگ‌و رابــەران لای چینــی نوێــی لاوان لەژێر ســایەی عەولەمەدا، شاجوانەكان، ســەماكەران‌و ئەكتــەرو یاریچــی‌و بەنــاو هونەرمەندانــە، زۆر جــار گەنجێــك تاناوی زانایەك یا شــاعیرێك یا نوســەرێك دەزانێت كــە بەهــۆی خوێندنــەوە فێری بــووە، ناوو ژیاننامــەی چەندین ئەكتەری ســینەمایی‌و یاریچی جیهانی دەزانێت‌و لەبەرییەتی، وێڕای پاراستنی وێنەكانیان‌و لاسایی كردنەوەیان لە ژیانی رۆژانەیدا!!

ئەمرۆ لاوان لەبەرامبەر ئەو هەڕەشــانەدا جگە لە زنجیری مل‌و گەردن‌و بازنی دەســت‌و جــل‌و بەرگــی كــورت‌و تەســك‌و چاككردنی ســەیری ســەرو قژو .... هتــد. هیچی تریان ئامادە نەكردووە بۆ بەرەنگار بوونەوەی.

ئــەوان لــە قۆناغێكی ناســكی ژیانیان دا رادەبــورن، بەداخەوە ئێمەش هەوڵمان نەداوە پێشەنگێكی باشی ئەوان بین، دەكرێت زۆر جار بگەڕێن بەشــوێن نموونەی بەرزی كۆمەڵگادا بۆ ئەوەی رێنمایی لــێ وەربگرن، بەڵام بەدی ناكەن.

كۆمەڵگایەك كە خۆی رۆشــنبیرو بەهێزو پتەو نەبێت ناتوانێت نەوەكانی ئاراستە بكات.

مــن تەنها لێرەدا بەر پرســانی پەروەردە لــە ماڵەوە تادەگاتــە لوتكەی دەســەڵات وریا دەكەمەوە، كە لاوان بڕبڕەی پشتی كۆمەڵگان، بە شــكانی ئــەو بڕبڕەیــە كۆڵەكەی پشــتی كۆمەڵگــە دەشــكێت‌و كەشــتیەكەمان نوقم دەبێت‌و هەزارو یــەك دەردو بەڵا روودەكاتە كۆمەڵگەكەمان‌و ئەوســا چارەسەركردنی زۆر ئەستەم دەبێت!!

ئەمرۆ بەفریــای گەنج‌و لاوانمان بكەوین باشترە، نەك سبەینێ كە لەوانەیە هیچمان پێ نەكرێت!!

# ئاسۆی وێنەیەك



سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیالی تیژو هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسكو خەیالە وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە، تا ببیتە خاوەنی یەکێك لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:

- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

**خەڵاتی یەکەم**
**هەڵمەت قەڵادزەیی**

**وێنەیەك**
**هەزارو یەك وێنەو ڕازی لە خۆیدا حەشارداوە**

ئای کەسادەین، تێنافکرین
نازانین کە بێهودەیە
نازانین کە ئاسۆی سبەی بێ
سپێدەیە
سەردەکەوین بەسەر پەیژەی
نەزانیدا
بەسەر پەیژەی سووری ژیانا
سوور بە گوناح، سوور بە تاوان
سەردەکەوین، تا بگەین بە لوتکەیەك
خۆمانی لێوە بخەینە ناو
دەریای تاڵیو نەهامەتیو ونبوون..
ونبوون لەناو بێئاگاییو

گێژاوی ژیان
سەوڵ لێبدەین، بە توانەوەی
گەرد بە گەردی، ژیانی
شیرینی منداڵیمان، گەنجێتیمان
زۆر نزیکە هێندە نەڕۆین
بتوێینەوە،
شەرابی ئەجەل بنۆشین
لەوانەشە لە پەیژەکە سەرنەکەوین
بەربینەوە
ڕاستی ناکامی بنۆشین
قەینا، گریمان گەیشتین
بەو دەریایە
کێ دەڵێ کە، لەو دەریا
بێینەدا

گەردی شیرینی هەوڵەکانمان
دەتوانێ تاڵیو تاریکی بشکێنێ
کێ دەڵێ کە، لە نقومبوون
کە هەناسەی هیوابڕا
گێژاو نامانخنکێنێ
یان ئەوەتا، سەراپای
ئەم ژیانە تاڵە، شیرین
شیرین، شیرین دەکەین
وەلێ ئەفسوس، هاوڕێ
ئەمە خۆکوشتنە
بوونمان لەو دەریا شیرینەدا
کۆمەڵەیەکی بەتاڵە
بۆیە دەریا چەند شیرین بێ
هاوڕێ بۆ ئێمە هەر تاڵە..

# ڕاهێنانی مێشك



**بە وردی لەم وێنەیە وردبەرەوە
هێزی مێشكو بیركردنەوەت بخەرەكار
بزانە چی دەبینیت؟
تا چ رادەیەك
دیدی تێڕوانینت وردە؟**



**خەڵاتی دووەم**
**باوكی ئاسۆ**

ئازیزەكەم: سیمای تاڵو خەم لێنیشتووی، قەرزارو دەردەدارو منداڵانی بێنازی وڵاتەكەم، بۆ كەمێك سووككردنی باری قورسو گرانی سەر شانیان، پێئەچێت، چاودروانی وتەیەكی، شەكەر ئامێزی، تۆ بكەن، چونكە زۆر جار بیستراوە، بەتەنها وتەی فێنكو سوكنایی بەخش، ئاگری دڵو هەناوی وەك كورە ئاسنگەر گڕگرتوی مرۆڤێكی بێ نەواو كارەسات بار، ئاوی بەسەر داكراوەو دامركاوەتەوە، خۆزەنگە هەندێ جاریش تاقە یەك وشەی ناسكو جوان، بەس بێت بۆ گۆڕینی واقعێكی تاڵ، بەڵام لەیادت نەچێت، زۆر جاری تریش، سارێژكردنی برینە پڕ ئێشو ژانەكانی جەستەی كۆمەڵگە، برینی دەیان پلەی سەختو هەورازی دەوێت.

# خودایە دڵێکی ئارام!

شێخانی

وتـەی حەکیمـەکان هەمیشـە جێگـای وردبوونەوەو تێرامانو بیرکردنەوەیە، چونکە ئەوان زیاتر لە گەوهەری شتەکاندا رۆدەچنو روکـەشو سـیمای شـتەکان زۆر بەهەنـد هەڵناگرن.

وتەیـەك کـە لـە چەندیـن حەکیمەوە گێردراوەتەوەو زۆر سەرنجی راکێشام، دەڵێت: (خودای پەروەردگار نیعمەتو خۆشـییەکانی ژیان بخەرە ژێر پێی گەمژەکانو دڵێکی ئارامو پڕ لە سوکناییم پێ ببەخشە)!!

**دڵێکی ئارام:** سەرچاوەکانی خۆشبەختیو سەرفرازیو کامەرانی، کانگای خەندەی جوانو هیواو ئاواتو خەونی ئەرخەوانی!

**دڵێکی ئارام:** لانەی خۆشەویسـتیو سۆزو ئەوین، باوەشی گەرمی میهرەبانیو دلۆڤانی!

دڵێکـی دڵنیـا، دڵێکـی ئاسـودە، دڵێکـی موتمەئین!

دڵێکی سافو بێگەرد، دڵێکی سپی، دڵێکی رووناك!

دڵێك نازانێت: رق چییە! کینە یانی چی؟ دوژمنایەتی چییە؟

دڵێـك فراوانـتر لە زەریـاکان، نەرمتر لە هەورە سپییەکان!

دڵێك ژوانـی هـەژارانو بێنەوایان بێت، هەمیشە پەرۆشی ژیانو گوزەرانیان بێت!

دڵێـك هەر بۆ خـۆی نەژی! لـە پێناوی هەموو چەوساواندا درێژە بە ژیان بدات.

دڵێك هەموو ئاواتی ئەوە بێت فرمێسکەکان بسڕێت، خەندەکان بڕوێنێت،

دەستی میهرو خۆشەویستی بەسەر سەری منداڵە بێ باوکەکاندا بێنێت!

خودایە من ئەو دڵەم دەوێت!

نەك دڵێکی بەردیـن، رەش، کوێر، چاوی کـەس نەبینـێ، هەمـوو ئاواتـی تێرکردنی ئارەزووەکانی بێت!

نـەك دڵێك مەسـت بووبێتو کەسـی بە خەیاڵدا نەیەت!

دڵێك بزانێت خۆشـی دونیـا تەنها پارەو سامانو موڵکی دونیایە!

تەنها رابواردنو کۆشكو تەلارو ئۆتۆمبێلو رەفاهیەتە!

نـا خودایـە گیان بـا هەمـوو ئەمانە بۆ خۆیان بێـت، لێت دەپاڕێمەوە: با هەموو نازو نیعمەتو رابواردنەکانی دونیا بۆ ئەوان بێتو تەنها دڵێکی ئارامو سپیم پێ ببەخشە!



# سێ پاڵاوگە

ئا/ فەرهاد عوسمان خدر



رۆژێــك یەكێــك گەیشــتە ســوقراتی فەیلەســوفی بەناوبانگ‌و زۆر بە ســادەیی پێی گوت "سوقرات، دەزانی چیم بیستووە لەبارەی یەكێك لە قوتابیەكانت؟!"

"بووەســتە" ســوقرات گوتی: بەرلەوەی هەواڵەكــەم پــێ رابگەیەنــی، حەزدەكــەم تاقیكردنەوەیەكی بچووكت پێ بكەم، كە پێی دەوترێت: (سێ پاڵاوگەكە)"

"سێ پاڵاوگەكە؟!"

"بەڵێ سێ پاڵاوگەكە، سوقرات گوتی: بەر لەوەی هەواڵم پێ بدەی لەبارەی قوتابییەكەم با بیپاڵێوین لەم سێ پاڵاوگەیە":

پاڵاوگەی یەكەم: پاڵاوگەی راستی، ئایا تۆ دڵنیای لەراستی ئەو هەواڵەی بەمنی دەدەی؟

پیاوەكــە وتــی: "نــا!" مــن هەواڵەكەم بیستوەو..."

سوقرات گوتی: "باشە" كەواتە تۆ دڵنیا نیت لەوەی بەمنی دەڵێی راستە یان هەڵەیە؟!"

بــا پاڵاوگــەی دووەم تاقــی بكەینــەوە، پاڵاوگەی خۆشــی، "ئایا ئەو هەواڵەی بەمنی رادەگەیەنــی لەبارەی قوتابیەكــەم هەواڵێكی خۆشە؟"

"نــا، بەپێچەوانەوە..."

"باشــە" ســوقرات گوتــی: كەواتــە تــۆ هەواڵێكی خراپ بە مــن رادەگەیەنی لەبارەی قوتابییەكەم سەرەرای ئەوەی دڵنیاش نیت لە راستی هەواڵەكە!"

پیاوەكــە زۆر هەســتی بــە شــەرمەزاری كرد..

ســوقرات بــەردەوام بــوو لە قســەكانی‌و گوتــی: هێشــتا دەتوانیت ســەركەوتووبی لە تاقیكردنەوەكــە، پاڵاوگــەی ســێیەم مــاوە! پاڵاوگەی ســوودگەیاندن" ئایا ئــەو هەواڵەی بەمنی دەڵێی لەبارەی قوتابییەكەم سوودم پێ دەگەیەنێت؟"

پیاوەكە گوتی: لەراستیدا نا...

"كەواتــە!" ســوقرات گوتــی: كەواتە تۆ هەواڵێكم پێ رادەگەیەنی نە راستەو نەخۆشەو نە ســوودو كەڵكێكی هەیە بۆمن، ئەی بۆ ئەو هەواڵەم پێ رادەگەیەنی؟!



## ۱ × ۳

(كلنا كالقمر لدينا جانب مظلم).

هەموومان وەك مانگ واین، لایەكی تاریكمان هەیە!

We are all like the bright moon, we still have our darker side

** ** ** **

لا تتحدى إنساناً ليس لديه ما يخسره.

كێبەركــێ لەگەڵ كەســێكدا مەكە، كە هیچی نیە بیدۆرێنێت‌و لەدەستی بدات!

Don't challenge someone whao has nothing to loose

** ** ** **

* الابتسامة كلمة معروفه من غير حروف.

* زەردەخەنە: وشــەیەكی روون‌و ئاشــكرایە بەلام بەبێ پیت.

The smile is a famous word without letters

** ** ** **

*لا تطعن في ذوق زوجتك، فقد اختارتك أولا.

رەخنــە لە زەوقــی خیزانت مەگــرە، چونكە یەكەم كەس تۆی هەڵبژاردووە!

Don't be critic to your wife's taste; she is the one who selected you at the first place.

** ** ** **

* إنك تخطو نحو الشــيخوخة يوماً مقابل كل دقيقة من الغضب.

* تــۆ هەموو رۆژێك نزیــك دەبیتەوە لە پیر بوون، بەرامبەر هەموو چركەیەك تورەبوون.

Every minute of anger will get you one more year older.

** ** ** **

لا تجادل الأحمق، فقد يخطئ الناس في التفريق بينكما.

دەمەقاڵــێ لەگەڵ مرۆڤی گێلدا مەكە، چونكە خەڵكی دوایی لەیەكتان جیاناكەنەوە!

Don't argue with an ignorant for it will be hard for people to differentiate between you

دایکی سرووش



# خێزانی بەختەوەر

بەختەوەری خێزان هونەرەو هەر کەسێك ئەو هونەرە بزانێت زۆر بە ئاسانی دەتوانێت ئەو بەختەوەرییە دەستەبەر بکات، خۆ ئەگەر کەسێك ئەو هونەرە ئاشنا نەبێت، ئەوا ژیانی دەبێتە دۆزەخ! جاران زۆر لە دایکان ئامۆژگاری کچەکانیان دەکرد پێش چوونە نێو ژیانی هاوسەرگیریو لە چەند ڕێسایەکی کورتدا ئەو هونەرەیان فێر دەکردن.

دایکێك ئامۆژگاری کچەکەی بەم شێوەیە دەکات: (کچی شیرینم، ئەگەر وەسیەتو ئامۆژگاریی فەرامۆش بکرایە بۆ کەسێك کە شارەزایە یا پایەدارە ئەوا من ئامۆژگاریم نە دەکردیت، بەڵام ئامۆژگاری وەبیر هێنانەوەیە بۆ کەسێك بێ ئاگا بێت، شارەزاییە بۆ کەسێك زانا بێت، کچی خۆم: ئەگەر ئافرەت بەهۆی دەوڵەمەندی باوکییەوە پێویستی بە هاوسەرەکەی نەمێنێت، ئەوا تۆ لە هەموو کەس زیاتر پێویستت پێی نەدەما، بەڵام وانییەو ئافرەتان بۆ بەختەوەری پیاوانن‌و پیاوانیش بۆ بەختەوەری ئافرەتان).

کچی شیرینم: تۆ ئەو ژینگەیە جێ دەهێڵیت کە تیایدا هاتوویتە دونیا، ئەو هێلانەیە چۆڵ دەکەیت کە تیایدا گەورە بوویت، بۆ هێلانەیەك کە نایناسیت، بۆ لای هاوڕێیەك کە هێشتا هۆگری نەبوویت، بەهۆی هاوسەرگیرییەوە بۆتە پاشا بەسەرتەوە، بەڵام بۆی ببە بە کەنیزەك بۆت دەبێت بە کۆیلە!

پاشان ئەم دایکە کۆمەڵێك ئامۆژگاری پێشکەشی کچەکەی دەکات‌و داوای لێ دەکات کە ئاگاداری ئەم خاڵانە بێت:

١- هاودەمی بکات بە قەناعەتەوە، مامەڵەی لەگەڵدا بکات بە گوێڕایەڵی کردنەوە، چونکە قەناعەت دڵ ئاسوودە دەکات، گوێڕایەڵیش خودا رازی دەکات.

٢- ئاگات لە شوێنی لوتی‌و چاوی بێت مەهێڵە هەرگیز شتێکی ناشیرینیت لێ ببینێت، یا بۆنێکی ناخۆشت لێوە بکات.

٣- ئاگات لە خواردن‌و خەوی بێت، چونکە گری برسێتی بە شاڵاوە. تێکچوونی خەویش مایەی تورە بوونە.

٤- چاودێری منداڵەکانی بکەو ماڵەکەی بپارێزەو جوان‌و ڕێك‌و پێك بەڕێوەی بەرە.

٥- هەرگیز نهێنی هاوسەرەکەت مەدرکێنەو سەرپێچی فەرمانەکانی مەکە. چونکە ئەگەر نهێنییەکانیت درکاند لە ستەمی دڵنیا نابیت، ئەگەر بێ قسەیی ئەویشت کرد، دڵی پڕ ڕق‌و کینە دەکەیت.

لە کۆتایی دا پێی دەڵێت: زۆر وریابە، هەرگیز دڵ خۆش نەبیت کاتێك ئەو خەمبارە یا بە پێچەوانەوە، چونکە لەیەکەم دا کەمتەرخەمیت‌و لە دووەمیشدا مایەی نیگەرانیت بۆی.

هاوسەرەکەت چەندە ڕێزت دەگرێت تۆ زیاتر، چەندە لەگەڵتدا بەخشندەیە تۆ زیاتر، چەندە ئەو بە قسەی تۆ دەکات تۆ زیاتر، ئەو چەند حەز بە هاودەمیت دەکات تۆ زیاتر.

ئەوەش بزانە کچی شیرینم، ناتوانیت ئەو شتانەت دەست کەوێت کە ئارەزووی دەکەیت لای ئەو تا ڕازیبوونی ئەو بەسەر ڕازی بوونی خۆت‌و ئارەزووی خۆتدا زاڵ نەکەی، هیوادارم خودای گەورەش بتپارێزێ‌و چی باشە ئەوەت بۆ هەڵبژێرێت.

# وەسیەتی حەکیمێك



لە حەکیمێکیان پرسی چ شتێك لە مرۆڤدا جێی سەرنجە؟

لە وەڵامدا وتی: مرۆڤ لە منداڵی بێزار دەبن، هەوڵ دەدەن تا گەورە بن، کاتێکیش گەورە دەبن، ئارەزوو دەکەن بگەڕێنەوە بۆ منداڵی.

تەندروستی خۆیان لە دەست دەدەن بۆ کۆکردنەوەی ماڵو سامان، هەر ئەو ماڵو سامانە بەکاردەهێننەوە بۆ گەڕانەوەی تەندروستیان.

بە دوو دڵیەوە بیر لە داهاتوویان دەکەنەوە، ئەمرۆیان بیر دەچێت، لە ئەمرۆو داهاتووش دا ناژین.

بەشێوەیەك دەژین کە هەرگیز نامرن، بە جۆرێکیش دەمرن هەروەك بڵێی هەرگیز نەژیابن.

# بەهارە گەشت

لێرەدا ئێمە دەمانەوێت تیشکێك بخەینە سەر مرۆڤ بەپێی ئەو بارودۆخەی کاریگەری هەیە لەسەری، گومانی تیادانیە لایەنی دەرونیو جەستەیی مرۆڤ کاریگەرە بەهەندێك هەڵوێستو کرداری ئاراستەکراوو ئەنجامدراو کە لەلایەن خۆیەوە ئەنجامدەدرێت، لایەنی دەروونی پێویستییەکی تەواوی هەیە بە ڕەخساندنی ئەو ژینگەیەی کە دەبێتە مایەی ئارامیو ئاسودەیی بۆی، لە هەمان کاتدا لایەنی جەستەیش پاشخانی لایەنی دەروونە، هەر دەرکەوتەو هەڵسوکەوتێك لەسەر جەستە هۆکارەکەی لایەنی دەروونییە، بەو جۆرە دەی نوێنێت لەسەر شاشەی جەستە، بۆیە لێرەدا ئێمە دەبێت لەگەڵ گونجاندنمان بۆ ئەو ژینگەیەی کە هەیە باشترین سود وەربگرین،

ژیانی سادەو سادەیی: ژیان فاکتەرێکە بۆ گەیشتن بەئاسودەیی، ئەوەی دەبێتە هۆی ئەو ئارامیو ئاسودەییە بە ئەنجام گەیاندنی بەهارە گەشتە لەکاتی گونجاو و بەشێوازێکی شیاو، سروشتی کوردستان سروشتێکی لەبارە بۆ کەوتنە سەر ڕێی ئەم جۆرە گەشتانە، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجو تێرامانە ئەوەیە کە ڕەچاوی چەند خاڵێك بکرێت لەماوەی دەستپێکردنەوە تاکۆتای گەشتەکە:

١- هەڵبژادنی ڕۆژی گەشتەکە بەپێی بارودۆخێکی لەبار، لەگەڵ ڕەزامەندی دەربڕین لەلایەن هاوبەشەکانەوە.

٢- دیاریکردنی ئەو شوێنو جێگەیەی کەدەتەوێت بۆی بڕۆیت، دەبێت بەژیرییەکی تەواوەوە دیاری بکرێت، بۆئەوەی ئەو شوێنە لەگەڵ ئەندامانی گەشتەکەدا بگونجێت.

٣- لەهەمان کاتدا دەبێت کاتی ڕۆیشتنو هۆکاری گواستنەوەو ڕێگاکەش دیاری بکرێت.

٤- دیاریکردنی کەسێك بۆ وەرگرتنی بڕیارەکان کە زۆرجار واپێویست دەکات بۆ ئەو ماوەیە.

٥- لەگەڵ ئامادەباشییەکی سەرەتایی بۆ هەموو ئەو سەرنشینانەی کەهاو سەفەرتن لەگەشتەکەدا لەپێناو سەلامەتیانداو ئاگادارکردنەوەیان لە تایبەتمەندییەکانی ئەوجێگایە.

٦- گوێگرتن لە ئاوازێك کە ببێتە مایەی ئارامی نەك بەپێچەوانەوە ببێتە مایەی هەراسانیو ماندوبوونی مێشك، دەبێت بەئاستێکی نزم بێت، چونکە توانای بیستنی مرۆڤ لە (٠dp8) زیاتر دەبێتە ژاوەژاو.

٧- بتوانرێت بۆ هەریەك لە ئاستە جیاوازەکانی تەمەن پشووی تایبەت بەخۆیان پێبدرێت، وەك بەکارهێنانی یاری بۆ منداڵان باشتر وایە هاوبەشییان لەگەڵ بکرێت.

٨- نابێت لەیادمان بچێت هەموو ئەوەی کە باسکرا بە ئامانجی دیتنی شوێنێکی نوێو تێفکرینێکی پڕ سەرنجی سروشت بۆ بەدەستهێنانی ئاسودەییو ئارامی لایەنی دەرونی.

لەگەڵ هیوای گەشتێکی سەلامەت بۆ هەموو لایەك.

هەڵاڵە عەلی



میهرەبان -دڵسۆز-چاکەکار بە کەوتە بەر دیدی خوێنەران



# ساڵرۆژی گۆڤاری

ئا/ ئاوات جەمال
خوێندکاری کۆلێژی تەکنیکی سلێمانی

زۆرن ژمارەی ئەو گۆڤارو بڵاوکراوانەی کە ئەمرۆ لە کوردستاندا دەردەچن، هەریەکەو بە شێوازێکی جیاوازو تایبەتمەندی خۆی لە بوارێکدا خزمەت دەکات، بەڵام بۆ یەکەمین جار لە کوردستاندا گۆڤارێکی تایبەتمەند بە بوارەکانی (کارگێری و گەشەپێدانی مرۆیی) دەردەچێت، وا بۆ ماوەی ساڵێکە لەم بوارەدا کار دەکات، بۆ چوونە نێو دووەم ساڵی خزمەتکردنی لەم بوارەدا بە باشمان زانی لە رێگەی ئەم ریپۆرتاژەوە، خوێنەران و ئازیزانی بڕیار بدوێنین، لە رێگەی ئاراستەکردنی چەند پرسیارێکەوە، تاکو بزانین ئاخۆ بڕیار تا چەند توانیویەتی جیاواز بێت لەو گۆڤارانەی کە ئەمرۆ لە کوردستاندا دەردەچن، هەروەها تا چەند توانیویەتی لە بوارەکەی خۆیدا خزمەت بە خوێنەرانی بکات، یاخود گۆڤارێکی وەها تایبەتمەند تا چەند پێویستە بۆ ئەمرۆی کوردستان:

سەرەتا چاومان کەوت بە بەڕێز د. عەتا کەریم مامۆستای زانکۆی سلێمانی بەڕێزیان وتی: دەرچوونی بڕیار شتێکی پێویست و گرنگە بۆیە دەست خۆشیتان لێ دەکەم، بڕیار یەکەم گۆڤارە لە بواری کارگێریدا، هەر بۆیە جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەو گۆڤارانەی کە ئەمرۆ لە کوردستاندا دەردەچن، من وەك مامۆستایەکی زانکۆ هەندێك جار توانیومە وەك سەرچاوەیەك بەکاری بهێنم بۆ گەیاندنی زانیاری بە خوێندکارەکانم، سەرەڕای ئەوەی لە بوارە پەروەردەیەکەیدا سودێکی زۆرم لێ بینیوە، بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکانم و خوێندکارەکانم بە گشتی.

★ **مامۆستا ئەنوەر خاوەنی کتێبخانەی پەیام:** گۆڤاری بڕیار گۆڤارێکی تاقانەو دەگمەنە لە بوارەکەی خۆیدا، توانیویەتی خزمەتێکی زۆر باش بکات بە خوێنەرانی، بۆ سەلماندنی ئەم راستیەش فرۆشێکی باشی هەیەو ژمارەیەکی زۆر لە خوێنەرانی داوای ژمارەکانی پێشوومان لێ دەکەن.

★ **عەتا حسین:** وەك بازرگانێك وتی: گۆڤارێکی متمانە پێکراوو زانستییە، بۆیە من لە دوو رووەوە زۆر سودم لەم گۆڤارە بینیوە:

یەکەم: بەو پێیەی کە بابەتەکانی تازەو نوێن، لەبواری رێکخستنی کاروبارەکانی کارگێریدا بۆ رێکخستنی کارەکانم، لە بواری بازرگانی و سەرمایەگوزاریدا سودێکی زۆرم لێ بینیووە.

دووەم: لە رووی پەروەردەییەوە سوودێکی زۆری بە من گەیاندووە، بە تایبەت بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانم، هەر بۆیە زۆر جار ئەو بابەتانەی کە لەگەڵ ئاستی تێگەیشتنی منداڵەکانمدا دەگونجێت، پێکەوە دادەنیشین و بۆیان دەخوێنمەوەو گفتوگۆ لەسەر بابەتەکانی دەکەین، هەر بۆیە پێشنیار دەکەم بۆ هەموو داموو دەزگا حکومی و ئیدارییەکان بە تایبەت بەڕێوەبەرو فەرمانبەران کە ئەم گۆڤارە بخوێننەوەو سوودی لێ ببینن، چونکە بابەت و رێنمایی گرنگی تێدایە بە تایبەت لە بواری پەیوەندی نێوان فەرمانبەرو بەڕێوەبەردا، هەروەها بۆ بەڕێوەبردنی کارە ئیدارییەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتوو.

★ **زانست زانا، راهێنەر لە بواری گەشەپێدانی مرۆیدا:** بە دوور لە باسی سیاسەت کە ئەمرۆ سەرتاپای دونیای راگەیاندنی کوردی گرتۆتەوە، دەرچوونی بڕیار بە تایبەتمەندبوونی لە ناوەرۆك و شێوازدا بۆتە هۆی ئەوەی کە خوێنەرەکانیشی تایبەت بن، بۆیە زیاتر لە باوەشی نوخبەی کۆمەڵگەدا دەبینرێ نەك کۆمەڵگە بەگشتی. ئەگەر ئەمە لە روویەکەوە جێگەی شانازی بێت بۆ بڕیار، ئەوا ئەرك و کاری داهاتووی ئەوەیە کە زیاتر کار بکات بۆ زیاتر چوونە نێو خەڵکی و خوێنەرانی بە گشتی، هاتنە ناوەوەی بڕیار ئەوەی لا دروست کردم کە هێشتا کۆمەڵەکەسانێك هەن کە لە خەمی تاك و کۆمەڵگەدان، بۆیە دەکرێت ئومێدیان لەسەر بنیات بنرێ بە تایبەت لە بارودۆخێکی وەك ئەمرۆی کوردستاندا، کە بەهۆی کێشەی جەنگ و بارودۆخی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتییەوە، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەدەست کێشەو گرفتی (سۆسیۆ سایکۆلۆژی)یەوە دەناڵێنن، بۆیە دەرچوونی گۆڤارێکی لەو شێوازە کارێکی پێویست بوو تاکو بتوانێت ماندوویەتی مێشك برەوێنێتەوەو پشوویەك بە دڵ و دەروون بدات، بە دوور لە دونیای سیاسەت و نا عەدالەتی و زوڵم و زۆرداری.

★ **عوسمان فەتاح/ فەرمانبەر:** ئەگەر نەتوانم بڵێم بڕیار لە چڵەپۆپەدایە، ئەوا دەتوانم بڵێم لە ریزی پێشەوەی میدیا سەرکەوتووەکاندایە، چونکە گۆڤارێکە گەلێك بابەتی زانستی و ئەکادیمی چاکی تێدا بڵاو دەکرێتەوە، کە دەکرێت هەموو کارمەندێك لە بواری پراکتیکدا سودی لێ ببینێ لە کاری رۆژانەیدا، لە هەر ئاست و پلەیەکی بەرپرسیاریدا بێت.

★ **فەرهاد عەلی خوێندکاری زانکۆی سلێمانی:**
بڕیار ئەو گۆڤارەی کە ناوو ناوەرۆکی زۆر جیاوازە لەگەڵ هەموو ئەو گۆڤارو چاپەمەنییانەی کە ئەمرۆ لە کوردستاندا دەردەچن، چونکە بڕیار بە واتای متمانە بە خۆبوون و بەرنامەرێژی لە کارەکاندا، هەروەها بە واتای بە گەورەزانینی مرۆڤ، چونکە هەر خودی مرۆڤ خاوەنی دەستکەوتە مادی و مەعنەوییەکانە لە ژیاندا، بڕیار هەڵگری ئەو تێروانین و بیرە سوود بەخشەیە کە دەیەوێت خزمەتی مرۆڤ و تاکی کوردی پێ بکات، و کوردیش بتوانێت وەك هەر مرۆڤێکی تری ئەم دونیایە هەموو تواناکانی خۆی بەگەڕبخات و پشت بەخۆی ببەستێ، لە بڕیاردان بەشێوەیەکی دروست لە بەڕێوەبردنی کارەکانیداو توانای

# بڕیار

بڕیاردانی لا دروست ببێت.

* ژینۆ جەمال: خوێندکاری کۆلێژی تەکنیکی سلێمانی: من وەك خوێندکارێکی کارگێڕی توانیومە سودێکی زۆر لەم گۆڤارە ببینم، لە بوارەکەی خۆمدا بۆتە هۆی زیاتر پەیدابوونی شارەزایم، سەرەڕای ئەوەی کە لایەنە مرۆییەکەی جێگەی دەستخۆشیو هەڵوێستە کردنە لە سەری.

مامۆستا کارزان مەهدی/ سەرۆکی بەشی کارگێڕی لە زانکۆی سلێمانی:
دەست خۆشیتان لێ دەکەم هیوای بەردەوامیو سەرکەتنتان بۆ دەخوازم، لە راستیدا گۆڤاری بڕیار گۆڤارێکی زۆر باشە کە لەبواری کارگێڕی دا دەنوسێت، تاکە گۆڤارە کە لە بواری کارگێڕی دا بەزمانی شیرینی کوردی دەردەچێت، بڕیار یەکێکە لە گۆڤارە باشەکان کە بابەتی زۆر گرنگ لە بواری کارگێڕی دا دەخاتە روو، یەکێکی تر لە گرنگییەکانی ئەم گۆڤارە ئەوەیە بابەتی دەرەکی دەخاتە بەرچاوی خوێنەران کە بە شێوازێکە هەموو کەس دەتوانێت لێی تێ بگات، نەك تەنها ئەو کەسانەی کە پسپۆڕن لە بواری کارگێڕیدا.

ئارام محەمەد/ قۆناغی سێیەم/ بەشی کارگێڕی:
پڕ بە دڵ پیرۆزباییتان لێ دەکەم، ئێمە وەك خوێندکارانی بەشی کارگێڕی زۆر سودمان لەم گۆڤارە نایابە بینیوە، بە تایبەت لە بواری کارگێڕیدا، هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

ڕێبوار عوسمان/ خوێندکاری بەشی کارگێڕی: بە بۆنەی ساڵیادی گۆڤارەکەمان گۆڤاری بڕیار پیرۆزباییەکی زۆر گەرمتان لێ دەکەم، بە تایبەت هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بەشدارن لە دەرچوونی ئەم گۆڤارەدا، هیوادارم بەردەوامو سەرکەوتوو بن، لە راستیدا زۆر سودمان لێ بینیوە لە هەموو روویەکەوە هیوای بەردوامیو سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم.

ئەحمەد محەمەد: خوێنەرێکی بڕیار: بەراستی من سودی زۆرم لێ وەرگرتووە، بڕیار توانیویەتی جێگای خۆی بکاتەوە، بوونی گۆڤارێکی لەم شێوەیە بۆ وڵاتەکەمان زۆر پێویستە، چونکە بێگومان کوردستان لە بواری کارگێڕی دا لە ئاستێکی باشدا نییەو شارەزاییمان زۆر کەمە، دووبارە هیوای بەردەوامیتان بۆ دەخوازم.

جەعفەر عومەر/ خوێندکاری قۆناغی شەشەمی پزیشکی/ زانکۆی سلێمانی: لە ساڵیادی دەرچوونی گۆڤاری بڕیاردا پیرۆزباییتان لێ دەکەم، هیوادارم بەردەوامو سەرکەوتوبن، هیواخوازم بڕیار بتوانێت ئاستی بەرزی خۆی لە رووی زانستییەوە وەك خۆی بهێڵێتەوەو بەردەوام بێت.

فیردەوس عەلی/ بەکالۆریۆس/ علوم بایەلۆجی:
سەرەتا دەست خۆشیتان لێ دەکەم، زۆر خۆشحاڵم بە بوونی ئەم گۆڤارە بە سوودە، من بەش بە حاڵی خۆم زۆر سودمەند بووم لێی، چونکە ئەم گۆڤارە جیا لە گۆڤارەکانی تر رۆشنبیرییەکی باش دەبەخشێت بە خوێنەران، هەروەها بۆتە هاندەرێك بۆ گۆڕینی ئەو ڕێگایانەی کە پێشتر گرتوومانە، فێری زۆر شتی کردووین، زانیاری باشی تێدایە بە تایبەت ئەو ڕێنماییانەی کە فێرت دەکات چۆن مامەڵە لەگەڵ کەسێکی تر بکەیت، هەروەها چارەسەرێکە بۆ زۆر کێشە، بابەتەکانیان بەهێزو بە پێزو سەرنج راکێشن، کەسایەتیت بۆ دروست دەکاتو وات لێدەکات کە شێوازی خۆت بگۆڕیت لە کارەکانتدا.
لە کۆتاییدا هیوای سەرکەوتنو تەمەن درێژیتان بۆ دەخوازم، هیوادارم سەرکەوتوو بن بۆ گەیاندنی پەیامو بیروبۆچونتان لە ڕێگەی بڕیارەوە...

پیرۆز بێت ساڵیادی گۆڤاری بڕیار...

*محمەد حسین خوێنەرێکی بڕیار: بڕیار هۆکارێکە بۆ برەودان بە هێزی بڕیاردان، یان بڕیار هۆکارێکە بۆ بە توانا کردنی هێزی بڕیار.

*فەرمان فارس خوێنەرێکی بڕیار: بڕیاردان گرنگە، گرنگتر لەو گۆڕینی بڕیارە، بڕیار توانیویەتی بڕیارەکان بگۆڕێت لە بڕیاردان لەسەر دەورووبەر.

*بارین محەمەد ئەمین خوێنەرێکی بڕیار: بە بۆچوونی من دەرچوونی وەها گۆڤارێك پێویستییەکی گرنگە بۆ کۆمەڵگا، بڕیار بۆشاییەکی گەورەی پڕکردۆتەوەو زۆر گرێی لەبەردەم خوێنەراندا کردۆتەوە.
توێژەرانی کۆمەڵایەتی لە منداڵپارێزی کوردستان/ هەولێر

هاژە شیروانی مامۆستای کۆلێژی بەڕێوەبردنو ئابوری

زانکۆی سەلاحەدین

پیرۆزبایی ساڵیادی دەرچوونی یەکەم ژمارەی ئەم گۆڤارە ئازیزەتان لێبێت، پێتان دەڵێم ئەگەر بهاتبا پسپۆڕانی بواری کارگێڕیش لەم گۆڤارە کاریان بکردایە، بە بێگومان لەوەی ئێستا باشتر نەدەبوو، ئەمەو سەرەڕای دووری پسپۆڕی ستافی گۆڤار بەڵام دەتوانم بڵێم شۆڕشێکتان لەم بوارەدا بەرپاکرد، دەستتان خۆش ئێوە مایەی شانازین جێگای ڕێزنو زۆر گەورەن، خوای گەورە سەرکەوتوو و تەمەن درێژتان بکات.
هەر شادبن.



بەشی دووەمو کۆتایی

بەرزان ئەبوبەکر ڕەشید

# جگەرەکێشان واتە مردنێکی لەسەرخۆ!

هۆکاری زۆری جگەرە کێشان لەم وڵاتەی ئێمەدا بەبێ ئەوەی بیر لە زیانەکانی بکرێتەوە سەرەکیترینییان ئەمانەن:

١- نەبوونی رۆشنبیری تەندروستی: ئەگەر جگەرە کێش بە زەرەرو زیانو ئاکامی جگەرە کێشان ئاشنا بووایەو ئەگەر بیزانیبایە کڕینی هەر پاکەتێکی جگەرە بریتییە لە کڕینی کوشندە ترین نەخۆشی بەڵام هێواش هێواش هەرگیز زاتی ئەوەی نەدەکرد بەو رێژە زۆرە جگەرە بکێشێت.

٢- چاولێکەریو لاسایی کردنەوەو پێشبڕکێ: زۆرێك لە جگەرەکێش حەز ناکات هاورێکەی لەو زیاتر جگەرە بکێشێت، یان بۆ ئەوەی وەکو دەستکەوتوو ئازایەتییەك ناوی ببەنو بڵێن: (فلان کەس رۆژی سێ پاکەت جگەرە دەکێشێت)، یاخود زۆرێك لە دایکانو باوکان جگەرە کێشن منداڵەکانیان لاسایی ئەوان دەکەنەوەو بەڵکو زۆر جار خراپتر لە ئەوان جگەرە دەکێشن، یان خەڵکانێك لە ئاستی بەرزدا، یا خاوەن بڕوانامەو پسپۆڕنو یا کەسانی ئەکادیمین بەڵام جەگەرە دەکێشن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کەسانێك لاساییان بکاتەوە، چونکە پێیان وایە ئەگەر جگەرە خراپ بووایە ئەوا ئەو جۆرە کەسانە جگەرەیان نە دەکێشا.

٣- بێکاری: هۆکارێکی تر بۆ زۆری جگەرە کێشان بریتییە لە بێکاری، چونکە ئەگەر مرۆڤ رۆژانە سەرقاڵی ئیشو کارێك بێت، بواری ئەوەی نابێت کە بەو رێژە زۆرە جگەرە بکێشێت.

٤- هەرزانی نرخ: ئەمەش یەکێکە لەسەرەکیترین هۆکاری جگەرەکێشان، ئەگەر سەرنج لە نرخی پاکەتێك جگەرە بدەین دەبینین لە هەموو شت هەرزانترە، نرخی هەندێك جۆری پاکەتی جگەرە تەنها (٢٥٠) دیناری بریمەرە! کورد وتەنی لە تۆڵەکە هەرزانترە. لە کاتێکدا هەمان پاکەت لە وڵاتانی ئەوروپی لە (١٠) دۆلار کەمتر نییە! کەواتە هەرزانی نرخ بۆتە هۆی ئەوەی کە مێرد منداڵانیش دەتوانن بە ئاسانی جگەرەیان دەست بکەوێت.

٥- کەمتەرخەمی راگەیاندن: لەسەر هەموو پاکەتێك نووسراوە هۆکاری سەرەکییە بۆ تووشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجە! لەگەڵ ئەوەشدا راگەیاندنەکان زۆر بەدەگمەن نەبێت گرنگی نادەن بە بڵاوکردنەوەی زیانەکانو ئەو نەخۆشییانەی کە مرۆڤ بەهۆی ئەو پەتا کوشندەوە تووشی دەبێت.

٦- توڕەییو خەم: زۆرێك لە خەڵکی لە کاتی خەمو توڕەبووندا پەنا دەبەنە بەر جگەرە کێشان، پێیان وایە جگەرە کێشان دەبێتە هۆی نەمانو کەم بوونەوەی توڕەییو خەمەکانیان.

## چۆن دەتوانیت واز لە جگەرەکێشان بهێنیت؟

ئەوەی لەسەر شانی تۆ پێویستە ئەنجامی بدەیت بۆ ئەوەی لەو دەردە کوشندەیە رزگارت بێت، رەچاوکردنی ئەم خاڵانەیە کە یارمەتیت دەدات بۆ واز هێنان لەو پەتایە:

★ ئەوەی لەسەر تۆ پێویستە:

١- بەکارهێنانی حەبی (Zyban)، لە ٣٠٪ ئەو کەسانەی بەکاریان هێناوە پاش سێ مانگ لە بەکارهێنانی سەرکەوتنیان بە دەستهێناوەو بۆ یەکجاری وازیان لە جگەرەکێشان هێناوە.

٢- بەکارهێنانی حەبی (Chaytix) لە ٤٤٪ ئەو کەسانەی بەکاریان هێناوە سەرکەوتووبوونو توانیویانە واز لە جگەرەکێشان بهێنن.

٢- بەکارهێنانی نیکۆتین لە شێوەی بنێشتدا، خەڵکانێکی زۆر سوودیان لێ بینیووە.

٣- بەکارهێنانی (پاچ) شتێکی رەشی خڕە لەزگەیە نیکۆتینی تێدایە لە باڵ دەدرێت هەڵی دەمژێت بۆ مێشك.

٤- زاڵبوون بەسەر خودی خۆتدا، ئەویش بەم رێگایانە دەتوانیت بەسەر خودی خۆتدا زاڵبیت:

أ- ئەو کەسانەی وازیان لە جگەرە کێشان هێناوە بیانکە بە سەر مەشقی خۆت:

کەسانێکی زۆر هەن لە نێو کۆمەڵگەدا وەکو تۆی ئازیز لە سەرەتای لاویانەوە ئالوودەی جگەرە کێشان بوونو بۆ ماوەیەکی زۆرو بەرێژەیەکی لە رادەبەدەر جگەرەکێش بوون، بەڵام ئێستا خۆشبەختانە بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە وازیان لەو دەردە کوشندەیە هێناوەو خۆیانو دەوروبەرەکەشیان ئاسوودە کردووە.

بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنا بین بە ژیانی هەندێك لەو کەسانەی کە وازیان لە جگەرە کێشان هێناوە با پێکەوە گوێبیستی چیرۆکی ئەو کەسانە بین کە وازیان لە جگەرەکێشان هێناوەو ئێستا زۆر ئاسوودەنو هیوادارن تۆی بەرێزیش چاویان لێبکەیت:

★ (حاجی حسین) پیاوێکی بەساڵاچووەو تەمەنی نزیکەی (٨٠) ساڵە لە شاری سلێمانی دادەنیشێت، باری تەندروستی تا رادەیەك جێگیرەو زۆر ئاسوودە لەگەڵ خانەوادەکەیدا ژیان بەسەر دەبات، ئەم پیاوە بەتەمەنە چیرۆکی وازهێنانی لە جگەرەکێشان بەم شێوەیە گێرایەوە: لە ساڵی (٢٠٠٠) نەخۆشکەوتم ماوەی چەند رۆژێك لە نەخۆشخانە مامەوە دوای ئەوەی پزیشکەکان چەند تیشكو پشکنینێکیان بۆ کردم، بەیانیەکیان کە هێشتا خۆر بەتەواوەتی تیشکە ئەرخەوانیەکەی

دەرنەخستبوو، پزیشکێك هات بۆلام و پێش ئەوەی پرسیارم لێبکات سەیرێکی ئەشیعەو پشکنینەکانی کردم و کەمێك سەری راوەشاندو بەسەر سورمانەوە وتی: حاجی چەند ساڵە جگەرە دەکێشی؟ منیش بەوپەڕی ئارامییەوە وتم: تۆ بفەرموو تەمەنت چەندە؟ پزیشکەکە لای سەیربوو بەڵام لەبەر دڵی من پرسیارەکەی ئاراستەکردم و وتی: باشە کەواتە تەمەنت چەندە؟ منیش وتم: تەمەنم نزیکەی (٧٠) ساڵە، جگە لە شەش ساڵی منداڵی، هەموو ساڵەکانی تری تەمەنم جگەرەم کێشاوە! پزیشکەکە بە سەرسورمانەوە وتی: رۆژی چەند جگەرە دەکێشیت؟ وتم: بفەرموو رۆژی چەند پاکەت؟ ئەویش وتی: باشە رۆژانە چەند پاکەت دەکێشیت؟ منیش وتم: رۆژانە قوتویەك تووتنی فەل دەکێشم لەگەڵ سێ پاکەت لەمانە (پاکەتەم لەلابوو)، پزیشکەکە ئەم جارەیان زیاتر سەری سورما! پاشان چپەیەکی کرد لەگەڵ برازاکەمدا.

وتم: دکتۆر لەوە ئەچێ دەردەکەم کوشندە بێت و ناتەوێ پێم بڵێی؟ وتی: نا شوکر باشی، وتم: دەڵێی چی وازی لێبهێنم؟ زەردەخەنەیەکی کردو وتی: تۆ دەڵێی لە (٦) ساڵانەوە جگەرە دەکێشم، تازە چۆن بەم تەمەنەوە دەتوانیت وازی لێبهێنیت؟ وتم: ئەوە بەڵێن بێت لەم ساتەوە جگەرە ناکێشم بڕوام بەخۆم هەیەو دەتوانم بەڵێنەکەم ببەمە سەر، هەر بۆیە بانگم لە برازاکەم کردو پێم وت:

**مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت واز لە جگەرەکێشان بهێنیت پێویستە خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزو پۆڵاین بێت و بڕوای بە خۆی هەبێت**

پاکەت و چەرخ و قوتووی تووتنەکەم فڕێ بدە بەڵێنمدا لەمڕۆ بەدواوە جگەرە ناکێشم.

پزیشکەکە پێکەنی و بە برازاکەمی وت: بڕیارەکەی رەنگە تەنها دوو کاتژمێر بخایەنێت، ئەو ناتوانێت لەو تەمەنەدا بە ئاسانی کۆنترۆڵی خۆی بکات و واز لە جگەرە کێشان بهێنێت.

حاجی: بڕیارمداوە وازی لێ بهێنم، هەرگیز بیری لێناکەمەوەو جارێکی تر جگەرە ناخەمەوە سەر لێوم، دڵنیابە دەتوانم خاوەنی قسەی خۆم بم و بڕیارەکەم جێبەجێ بکەم، برازاکەشم جگەرە کێش بوو بۆیە پێی وتم: بەڵێن بێت ئەگەر تۆ بتوانی وازی لێبهێنی ئەوا منیش پەیمانت دەدەمێ وازی لێبهێنم.

حاجی: تۆ وەکو منت بۆ ناکرێت هەرچەندە سەرەتای لاویتە، بەڵام بڕواناکەم تۆ بتوانی وازی لێبهێنی، چونکە ئێوەی لاو زیاتر گوێڕایەڵی هەواو ئارەزووەکانتانن. دوای مشتومڕی نێوانمان هەردووکمان بڕیارماندا بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە واز لە جگەرەکێشان بهێنین. حاجی دەڵێت نە پزیشکەکەو نە برازاکەم لەو بڕوایەدا نەبوون کە من بتوانم واز لە جگەرەکێشان بهێنم، ئێستا کە نزیکەی حەوت ساڵ بەسەر ئەو بەڵێنەدا تێپەڕیووە، سوپاس بۆ خوا جگەرەم بە دەستەوە نەگرتۆتەوەو هەرگیز بیریشم لێنەکردۆتەوە، برازاکەشم وەکو من توانی بەڵێنەکەی بباتە سەرو بەتەواوی و بۆ هەمیشە وازی لە جگەرە کێشان هێنا.

کەواتە بە بۆچوونی تۆ چی وایکرد ئەم دوو کەسە بتوانن واز لە جگەرەکێشان بهێنن؟ رەنگە لە رووی زانستییەوە باش نەبێت کەسێك دوای ئەو هەموو ئالوودە بوونە یەکسەر بڕیاری وازهێنانی بدات، بەڵام چونکە خاوەنی بڕیارێکی یەکلایی کەرەوەو ئیرادەیەکی بەهێزو بڕوا بە خۆبوون بوون توانیان بە ئاسانی سەرکەوتن بەدەست بهێنن! هەر ئەوەش خاڵی سەرەکی سەرکەوتنی ئەم دوو کەسە بوو، کەواتە با من و تۆش هەر لاساییکەرەوەی شتە خراپەکان نەبین، بەڵکو هەوڵ بدەین لاسایی شتە باشەکانیش بکەینەوە.

ب- ئیرادەیەکی بەهێز: مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت واز لە جگەرەکێشان بهێنیت پێویستە خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزو پۆڵاین بێت و بڕوای بە خۆی هەبێت، چونکە کاتێك تۆ بڕیارێك دەدەیت ئەگەر هەر جۆرە ئیحاحێك بدەیت بە مێشکت ئەو ئەوەت بۆ جێبەجێ دەکات، روونتر بڵێین: ئەگەر بەخۆت گوت: ناتوانم واز لە جگەرە کێشان بهێنم ئەوە بزانە کە ئیحاحێکی خراپت بە مێشکت بەخشیووە ئەویش لەسەر ئەو ئیحاحەی تۆ کار دەکات، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە وتت: وازی لێدەهێنم و هەرگیز بیریشی لێناکەمەوەو دڵنیاشم دەتوانم بڕیارەکەم جێبەجێ بکەم، ئەوا مێشکت لەسەر ئەو جۆرە بیر کردنەوەیە دەڕوات و دڵنیام سەرکەوتوو دەبیت، رەنگە چەند رۆژێکی سەرەتا کەمێك بێتاقەت بیت، بەڵام دڵنیابە پاشماوەیەك رقت لە دوکەڵەکەشی دەبێتەوە. تاوانە لاوێك لە سەرەتای لاویدا ئەوەندە لاواز بێت نەتوانێت ببێتە خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزو کۆنترۆڵی نەفسی خۆی بکات. ئەوەش بزانە هەر جۆرە ئیحاحێك بدەیتە مێشکت ئەو جێبەجێی دەکات، بۆیە پێویستە ئیحاحی گەشبینانەی پێ ببەخشین نەك رەشبینانە.

ج- خاڵێکی تر کە یارمەتیت دەدات بۆ وازهێنان لە جگەرەکێشان بیرکردنەوەیە لەو جۆرە نەخۆشیانەی کە مرۆڤ بەهۆی جگەرەکێشانەوە تووشی دەبێت: دەتوانیت مانگانە سەردانی ئەو نەخۆشخانانە بکەیت کە تایبەتن بە نەخۆشییەکانی (شێرپەنجە) لە سلێمانی نەخۆشخانەی (هیوا)و لە هەولێر نەخۆشخانەی (نانە کەلی)، بۆ ئەوەی زیاتر دڵنیا بیت کە ئەگەر بەرێزت واز لە جگەرەکێشان نەهێنیت، ئەگەری ئەوە چەندان قات زیاترە کە تۆش ئەمڕۆ یا سبەی بچیتە ئەو شوێنەو ببیتە یەکێك لەو نەخۆشانەی کە قوربانی جگەرە کێشانن، ئەو کات بە پێچەوانەی جارانەوە کە تۆ سەردانی نەخۆشەکانت دەکرد، ئێستا خەڵکی دێن بۆ سەردانت، ئەگەر تا دوێنێ تۆ بەزەییت بە نەخۆشەکاندا دەهاتەوە ئەمڕۆ خەڵکی بەزەییان بە حاڵی تۆدا دێتەوە، ئەگەر تا دوێنێ سەردانکەر بوویت ئەوا ئەمڕۆ تۆ سەردانکراویت! کەواتە ئەمڕۆ باشترە لە سبەی تا بڕیار بدەی ئەو دەردە کوشندەیە لە خۆت دوور بخەیتەوە!

* ئەوەی لەسەر دەوڵەت پێویستە:

أ- بڵاو کردنەوەی رۆشنبیری تەندروستی: زۆر پێویستە هەموو کە ناڵەکانی راگەیاندن بە حکومی و ئەهلییەوە، هەروەها تەواوی رۆژنامەو گۆڤارەکان گرنگی بدەن بە بڵاو کردنەوەو هۆشیار کردنەوەی خەڵکی سەبارەت بە مەترسی و زیانەکانی جگەرەکێشان لە رووی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە، ئەمەش بە بەرنامەیەك و دووان تەواو نابێت بەڵکو پێویستە رۆژانە بە بیری خەڵکی بهێننەوە.

ب- دانانی باج لەسەر ئەو کۆمپانیاو لایەنانەی بریکاری کڕین و فرۆشتنی جگەرەن: وەکو لەسەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد جگەرە لە وڵاتی ئێمەدا لە هەموو شت هەرزانترە، ئەمەش وایکردووە بەو رێژە زۆرە بەکار بهێنرێت، بە تایبەت لە لایەن مێردمنداڵانەوە، لەبەرئەوە پێویستە حکومەت کار بکات بۆ ئەوەی نرخی جگەرە بەرز بکاتەوە بۆ ئەوەی هیچ نا منداڵانی خوار تەمەن پانزە ساڵ نەتوانن بەو ئاسانیە ببنە کڕیاری ئەو دەردە کوشندەیە. لە لایەکی تریشەوە ئەگەر جگەرە ئەوەندە هەرزان نەبوایە جگەرە کێش نەیدەتوانی بڵێت: رۆژی سێ پاکەت دەکێشم! دانانی باج کارێکی یاساییەو لە هەموو وڵاتانی دنیا سانسۆری زۆرو باجی زۆر لەسەر ئەو کۆمپانیایانە دادەنێن کە بریکاری کڕین و فرۆشتنی جگەرەن، ئەمەش باشترین چارەسەرە بۆ کەمکردنەوەی رێژەی جگەرەکێشان. بۆ نموونە: ئەگەر نرخی پاکەتێك جگەرە وەکو وڵاتانی ئەوروپی لانی کەم بە (١٠) دۆلار بووایە ئەوا بەو رێژە زۆرە بەکار نەدەهات و لە لایەکی تریشەوە خەڵکی بیریان لەو زیانە ماددییە زۆرە دەکردەوە کە بەو هۆیەوە تووشیان دەبێت ئەمەش وایان لێدەکات چی دی نەبنە کڕیاری ئەو دەردە کوشندەیەو هێواش هێواش وازی لێدەهێنن، لە لایەکی ترەوە کەسانی تازە پێگەیشتوو بە هۆی گرانی نرخەوە کەمتر بیری لێدەکەنەوەو بەڵکو هەوڵی خۆ دوور خستنەوەش دەدەن لەو پەتایە.

بەو هیوایەی هەموو ئەو خوشك و برا بەڕێزانەی کە دووچاری ئەو پەتایە بوون بتوانن هەرچی زووە وازی لێبهێنن و ببنە خاوەنی بڕیارێکی یەکلاییکەرەوەو بڕوا بە خۆبوون، بۆ ئەوەی خۆشیان و هاوڕێ و هاوکارو خانەوادەکەشیان دڵخۆش و ئاسوودە بکەن، ئەمەش تەنها بە بڕیاردانێکی بوێرانە دەبێت کە بفەرموون ئیتر لەمڕۆ بەدواوە چیدی کڕیاری ئەو نەخۆشییە کوشندە نابم.

بە هیوای بەختەوەری و کامەرانی و ئاسوودەیی و تەندروستییەکی باش بۆ هەمووان.

هەردی غازی

# ئایا سنوور دەبێت هەبێت؟!

لەودەمەی مرۆڤ بەدی هێنراوە ململانێ کردنی سنوریش هاتۆتە ئاراوە، گوێ بگرن لەقسەی فەرمانبەران: ئەمە کەی بەڕێوەبەرە؟ ئەمە کەی فەرمانگەیە ناتوانی جگەرەیەك بکێشی، قسەیەکی خۆش بکەیت، مەجالت نییە قاچێ راکێشی هەر لەبەر سنوور...

گوێ لە کچان بگرن لە خوێندنگەکاندا: ئەم خوێندنگەیە بەندیخانەیەکی گەورەیە، ناتوانی بەدڵی خۆت جل لەبەربکەیت، ناوێری دوو پارچە ئاڵتون بکەیت بەخۆتەوە، بەدڵی خۆت ڕێت نادرێ قژت بۆیە بکەیت، مامۆستا هات دەبێ هەستیتەوە، وتی بخوێنە دەبێ بخوێنی، ئای کە ناخۆشە سنوور..

گوێ لە کورەکان بگرن لەماڵەوە: پەرچەمت درێژ دەکەی یەکێ دێتو قرت بۆت کورت دەکاتەوە، قژت درێژدەکەی نایەڵن، جلی مۆدێرن لەبەردەکەی ڕێت لێ دەگرن، جگەرە دەکێشی خێرا لە پشتەملەوە زللەیەك دەخۆی، سەیری فیلم دەکەی ناهێڵن...

دەزانم! ئێوە نموونەی زیاترتان لایە لەسەر ئەم بابەتە، بۆیە خۆتان ئەو نموونانە یادی خۆتان بخەنەوە... لێرەدا دەپرسم: ئایا سنور دەبێت هەبێت؟ خۆم وەڵام نادەمەوە، سەرنج بدەن باگوێ لەچەند شتێ بگرین، کە ئەو وەڵامەمان دەدەنەوە:

خۆر: ئەی مرۆڤ! بۆ لە منو کارم ناروانی گەر ئەم هەسارانەی چواردەورم زۆر لێم نزیك بنەوە دەسوتێن، ئەگەر دوریش کەونەوە دەیبەستن لە سەرمادا.

زەوی: ئەی ئادەمیزاد! دەزانی ئەگەر ڕێم لێبگیرێ لایەکم نیشانی خۆر نەدەم چیتان بەسەردێ؟ ڕووەکان وشك دەبنو خۆشتان لەرو لاواز.. جگە لە چەندەها کێشەی گەورەو سەخت کە توشتان دەبێت.

ئەندامەکانی لەش:

زمان: ئەی مرۆڤ! بیرت لەوە کردۆتەوە گەر بە ئارەزوی خۆم بجولێمو بوەستم دەکەویتە چ حاڵەتێکەوە.. گەر هەرەمەکی کار بکەم لەوانەیە ڕۆژێ زۆر پێویست بکات بە خێزانەکەت بڵێی: (ببورە هەڵە بووم، ئەم دیارییەم بۆ هێناوی لەگەڵ ئەوەی قابیلی تۆی نییە، بەڵام هیوادارم ببێت بەهۆی ئەوەی لێم ببوری)، کاتێ تۆ دەتەوێ ئەمە بڵێی لەوانەیە من تاقەتی جولەم نەبێ ئای لەو خەجاڵەتییەی دێ بەسەرتدا..

دەرەچەی خوارەوەی گەدە: ئەی مرۆڤی پێویست بوو بە خۆراك: هەستت بەوە کردووە من بۆ هەمیشە بکرێمەوە چیت بەسەر دێ، هەرچی بخۆیت تەنها کەمترین چێژو سودی لێ وەردەگری ئەویش لەدەمتدا، کە دێتە خوارەوە بۆ گەدە من پێی دەڵێم: بڕیارم داوە بکرێمەوەو تاقەتی کارکردنم نەماوە، ئەگەر خەوم بێتو بخەومو گەدەت قەپات بکەم.. وەی بەحاڵت چی ڕوودەدا. ·ئەم دکتۆرو ئەو دکتۆر دەکەی هەتا سنگت شەق دەکەنو بەزۆر من لەخەو هەڵدەستێنن..

پەنکریاس هاواری کرد:

وەرن بۆلای من ئەگەر ئەنسۆلین کەم برژێنم توشی چەندەها دەردو بەڵا دەبن، ئەگەر زۆر برژێنم دیسان توشی هەلاکەت دەبن..

هۆرمۆنەکانی تایبەت بەڕەگەزی نێرینە وتی: باشە من چۆن لای ڕەگەزی نێر کاردەکەم، ئەگەر بەو جۆرەش لای ڕەگەزی مێینە کار بکەم دەزانی ڕەگەزی مێینە چی بەسەردێ بەدەنگی گڕو ریشو سمێڵەوە کچانتان دەبینی!

وادابنێ سبەینێ زۆر پێویستت بەوەیە زوو لەماڵ دەرچی بەڵام کە دەگەیتە ترافیك لایتەکە دەبینی ترافیك لایتەکە بەئارەزووی خۆی کاردەکات دەمێ سورو دوایی زەردو پاشان سەوز، هەرجارەو بە جۆرێ، لەو باوەڕەدای قژت نە ئالۆسکێو قورگت وشك نەبێتو چاوەکانت دەرنەپۆقن...

بەشداربومان بەقەدەر هەموو شتەکانی ئەم گەردونە هەیە.. بەڵام پێم وابێ ئەمە بەسە بۆ ئەوەی پێت بوترێ «ئازادیش بریتییە لە کۆمەڵێك سنوور»!

# تۆپ خڕە
# بەڵام ژیان خڕ نییە!

کە منداڵ بووین و لەگەڵ هاوڕێکانمان بۆ (تیپاوتیپ) بەرامبەر منداڵانی هاوتەمەنمان دەچووین بۆ گەڕەکێکی تر، هەر کات یاریەکەمان بدۆراندایە، دڵخۆشی خۆمانمان دەدایەوە، بۆ ئەوەی جارێکی تر بێ هیوا نەبین بە خۆمانمان دەوت: ئێمە چاك یاریمان دەکرد (حۆڵمان کردبوون)، بەڵام ئیتر تۆپ خڕەو باری بۆ کەس نییە.

کە گەورەبووین و چووینە ناو کایە جیاوازو ڕێگا پێچاوپێچەکان و بە بەرزاییە وزە پروکێنەکاندا سەردەکەوتین و بە هەر هۆیەك ڕێگاکەمان هەڵە دەکرد یان لە بەرزاییەکەوە دەهاتینە خوارەوە، بە یەکترمان دەوت: ئیتر بەخت و ناوچەوانەکەمان هەر ئەوەندەیە، نایهێنێ بڵێین چی؟ بەراستی دونیا بێ وەفایە!

ئەوە منداڵی و بێ ئەزموونی بوو! ئەمەش تەمەنی گەورەیی دەورەگیراو بە متمانە بەخۆنەبوون و ئیرادە لاوازی و نەبوونی ئارەزووی بەهێزو کاری بەردەوامی بێ ماندووبوون. .. ئەو کاتە وابوو، تۆپ خڕ بوو دەکرا گۆڵی هەڵەی پێچەوانەش تۆمار بکرایە (گەرچی مەشقی بەر لە یارییەکەش کاریگەری لەسەر ئەنجام دەبوو)، وەلێ هەنووکە ئیدی دەزانین (یان دەبێت بزانین) کە بیانوو پاساوەکان بچووکمان دەکەنەوەو تواناکانمان لە قاڵب دەدەن و هیواو حەزەکانمان لە ناو دەبەن.

هاوڕێم! خوێنەری بەڕێز: تۆپ خڕەو دەشێت هەر جارەو بە لایەکدا بڕوات و بەرکەوتنی بە بەردێکی بچووکدا ڕێڕەو و ئاراستەکەی بگۆڕێت، بەڵام ژیان خڕو بێبار نییە، ژیان پڕوپوچ نییە، بەڵکو ئەو شێوەیەی هەیە کە خۆت پێی دەدەیت، ئەو بارەی هەیە کە تۆ بۆی دروست دەکەیت... تۆیت تام و مانا بە ژیانت دەدەیت.

ڕاستە ژیان ناڕەحەتی و ئاستەنگ و تێکەوتنی تێدایە، بەڵام تۆ بە بیرکردنەوەکانت دەتوانیت ئەوانە بکەیتە جوانی و ئەزموون بۆ داهاتووت. ئاخر ئەگەر لێ گەڕێیت و پلانی داهاتوو کاری ئێستات نەبێت ئەو دەمە ژیانت دەشێوێت و دەبێتە بەشێك لە پلانی سەرکەوتنی خەڵك، دەبیتە پلەیەکی کاری ئەوانی تر، بزانە تۆش هەیت و دەبێت بوون و قەوارەت هەبێت... ئەوەش لە خۆڕا پێکنایەت.

هەوڵ بدە ژیانت ئەو شێوەیە وەربگرێت کە خۆت حەزی پێدەکەیت، جارێك و جارێك و جارێکی تر هەوڵ بدە، ماندوو مەبە، با ئارەزوویەکت هەبێت و کاری بۆ بکە، بیربکەرەوەو کاربکەو بەردەوامبە، دڵنیابە دواجار تام و ماناو جوانی دەدۆزیتەوەو ژیانیشت دەچێتە سەر ئەو شێوە بارەی کە دەیخوازیت و بە ڕوونی دەبینی کە ژیان خڕو بێبار نییە. بەڵکو ئەو کاتەی وازی لێدەهێنیت و خۆت دەدەیتە دەم (با)ی پێشهاتەکان ئیدی بەو جۆرەی لێ دێت. بۆیە ئاگات لە ژیانت بێت تا ڕووداوو ناحەزو ناڕەحەتیەکانی لێی نەفڕێنن و خۆت خاوەنی بێت.




## بۆ بڕیار

پەشێو مجید سماقەیی
کۆلێژی پەروەردەی هەولێر

زۆر گەڕام ، لەوێڵیا تۆم دۆزیەوە، لە سەحرایەکی وشك و چۆڵا تۆ گەیشتی بە فریام، زۆر بەهێمنی و لەسەرخۆیی باوەشی گەرمت واڵاکردو دەستی ماندوونەناست بۆ درێژکردم.

وتت ..............

هەرچی هەیە لەم دنیایە لەژێر دەستی تۆدایە، هەمووی دەست لەسەر سنگ وەستاون و چاوەڕوانی فەرمانی تۆن، بەڵام تۆی خاوەن دەسەڵاتی بێ ئاگا، تۆی خەواڵووی هەردەم نوستوو، دە هەڵسەوە تواناکانت بێنە وجود، سەرمایەت بخەرە کارو ئەم شەمەندەفەرەی بوونت وەگەڕخە.

مەترسە،،، هەروەك تۆ بوون ئەوانەی ئەمڕۆ کاروباری ئەم دنیایە دەبەن بەڕێوە، منداڵێکی ئاوازەبون ئەوانەی ئەمڕۆ دەسەڵاتیان لەنێودەستەو فەرمان دەدەن.

هەڵسە،،،، هەڵسەو توێشوی ئەم سەفەرەت لەکۆڵنێ و شەن و کەوی کردەوەکانت بکە، ئەم ماوەیەی نێوان ببڕە، ئاسۆی ڕوون چاوەڕێی تۆیەو سەرکەوتن لەسەر لوتکە بانگ رادێرێ و ناوی تۆ دەبات.

منیش لەگەڵ وتە ڕۆحییەکانی تۆ کۆڵ و بارم لەیەکناو پەیمانی هەوڵی بێ کۆتام دا بەخۆم و بەتۆشم وت: کە هەموو مانگێ ئەم ڕۆحە کزەم لەگەڵ تۆیا بارگاوی دەکەمەوە..............

بۆیە دەڵێم: هەرکە من تۆم دۆزییەوە من خۆم دۆزییەوە....................

ساڵیادی لە دایکبونت پیرۆز.

# لە ماڵەکەیاندا دەرگایەك هەیە!



**سایە فارس**

ماڵە ژوورێکی بچوکدا لەسەربانی یەکێك لە بێوەژنێکی هەژار لەگەڵ کوڕەکەی لە ژیانێکی سادەو بارودۆخێکی ناهەموارو سەختدا دەژیان... ئەو خێزانە بچوکە بە نیعمەتی رازیبونو قەناعەت کە گەوهەرێکە فەنابوونی نییە، رازابووەوە.

بەڵام ئەوەی کە دایکە هەژارەکەی خەمبار دەکرد باران بارین بوو لە وەرزی زستان دا، ژوورەکە بریتی بوو لە تەنها چوار دیوارو دەرگایەکی دارینی هەبوو، هاوکات سەقفیشی نەبوو!!

چوار ساڵ بەسەر لە دایك بوونی ئەو منداڵەدا تێپەڕی کردبوو لەو کاتەوە ئەو وڵاتە تووشی باران بارینی زۆر نەهاتبوو، بەڵام ئەو رۆژە هەورەکان کۆ بوونەوەو ئاسمانی شار بە هەوری تاریك داپۆشرا.... لە سەرەتای شەودا بارانێکی بە خوڕ ئەو شارەی گرتەوە، هەموو کەس بە دڵنیاییەوە لە ماڵەکانیان دانیشتبوون، تەنها بێوەژنو منداڵەکەی نەبێت کە دەبوایە بەرەنگاری ئەو بارودۆخە ناخۆشە ببنەوە!!.

منداڵەکەش بە روانینێکی دوودڵییەوە سەیرێکی کردو چووە ئامێزی دایکییەوە، بەڵام لاشەی دایکی هەموو تەڕبوو، لەوکاتەدا دایکەکە دەرگاکەی بە خەیاڵدا هات، بەپەلە دەرگاکەی لێکردەوەو دای بەسەر سوچێکی ژورەکەداو منداڵەکەی خستە پەنای دەرگاکەوە هەتا تەڕ نەبێتو بارانی بەخوڕی بەرنەکەوێت...

منداڵەکەش بە دڵخۆشییەکی بەرێئانەوە کە رووخساری زەردەخەنەی رازیبوونو قەناعەتی پێوە دیاربوو سەیرێکی دایکی کردو وتی: دەبێت ئەو کەسانەی هەژارنو دەرگایان نییە چی بکەن تا باران لێیان نەدات؟!!

ئەو منداڵە لەو کاتەدا هەستی کرد لە چینە دەوڵەمەندەکانە لە کاتێکدا دەرگایەکیان هەیە لە تەڕبوون دەیانپارێزێت..!!

ئەو رەزامەندییە چەندە جوانە!

ئەو رەزامەندییە سەرچاوەی بەختەوەریو ئاسایشی دەروونە...

پاراستنە لە نەخۆشییەکانی لە خۆبایی بوونو رقو کینە...

ئەگەر باش دیقەتی ئەو منداڵە بدەین دەبینین کە چەندە بەختەوەرە بەهۆی رازیبوونو قەناعەتکردنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرەرای هەژاریو نەبوونی ماڵێکی تەواو، هێشتا بیر لە کەسانێك دەکاتەوە کە لەخۆی هەژارترنو لەوانەیە دەرگایەكو چوارچێوەیەکیان نەبێت لە رێژنەی باران بیان پارێزێت!!

بۆیە دەڵێین قەناعەت کردن گەوهەرێکە هەرگیز لەناو ناچێت، ئەم وتەیە زۆربەمان بیستومانەو بەکاری دەهێنینو باوەریشمان پێی هەیە، بەڵام ئایا هەموومان قەناعەتمان هەیە بەوەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین؟

رازی بوونو قەناعەت کردن نهێنییەکە لە نهێنیەکانی ژیانێکی ئاسوودە، رازی بوونو سکاڵاو گلەیی نەکردن، چاونەبرینە ماڵی کەسانی تر بەوەی کە ئەو زیاتر لەتۆی هەیە، هەموو ئەمانە دەبنە مایەی ژیانێکی سادەی پڕ ئاسوودەو بەختەوەری.

خۆ ئەگەر چاوبریتە غەیری خۆت، دنیا لەبەر چاوەکانت دا رەش دەبێت، چونکە تۆش وەك ئەو مرۆڤی بەڵام ئەو لە زۆر رووەوە لەتۆ زیاتری هەیەو خاوەنی زۆر شتە کە تۆ بێ بەشی لێی.

ئەوەی لەبەر دەستایە بەشی خۆتە لەدنیادا، ئەوەشی لەبەردەستی کەسانی تردایە بەشی خۆیانە.

رازیبە بە بەشی خۆت چونکە رازیبوون بەوەی کە هەتە دەبێتە مایەی تامو چێژکردنی ژیانو ئاسوودەیی دەروونو بەختەوەریو رزگاربوون لە دڵتەنگیو غەمو خەفەت.

بۆیە دەڵێم: بەهۆی قەناعەتو رازی بوون بەوەی کەهەتە بە دڵخۆشیو ئاسوودەیی دەژیت.

بەهۆی قەناعەتو رازی بوون بەوەی کەهەتە بەباشترین شێوە دەژیت.

رقت لە کەس نابێتەوەو هەموو خەڵکیشت خۆشدەوێت.

سوپاسکردنی خوای گەورە لەسەر بەخششەکانی: تەندروستیو عەقڵو هۆشو دڵێکی ئاسوودە هەموو ئەوانە سەرکەوتنی دنیاو دوارۆژمانی بەدواوەیە.



# پاداشتی چاکە لەگەڵ دایك و باوكدا

مافناس: هێمن محەمەد عەلی

پیاوێك چوار كوڕی هەبوو، كاتێ ئەم پیاوە نەخۆش دەكەوێت، یەكێك لە كوڕەكانی بۆ ئەوەی خۆی خزمەتی باوكی بكات بە براكانی دەڵێت: ئەگەر ئێوە هەستن بە چارەسەرو خزمەت كردنی باوكمان، ئەوا بێبەش دەبن لە میراتەكەی، بەڵام ئەگەر من چارەوسەرو خزمەتی بكەم، هیچ شتێك لە میراتەكەی باوكمم ناوێت!

براكانی وتیان: زۆر باشە تۆ چارەسەرو خزمەتی بكەو لە میرات بێبەش بە... ئەم كوڕەیان خزمەت كردنو چارەسەری باوكی گرتە ئەستۆ، هەتا گیانی سپاردو هیچ شتێكی لە میراتەكەی باوكی وەرنەگرت... شەوێك لە شەوەكان لە خەویدا پیاوێكی بینی پێی دەوت: بچۆ بۆ فلانە جێگە (١٠٠) دینارت دەست دەكەوێت... كوڕەكەش وتی: خێروبەرەكەتی تێدایە؟ پیاوەكە وتی نەخێر... كاتێك بەیانی خەبەری بۆوە، بۆ هاوسەرەكەی باسكردو ئەویش پێی وت: بچۆ ئەو پارەیە وەربگرەو بەرەكەتەكەی ئەوەیە كە پێی بژینو خزمەتی خۆمانی پێ بكەین، بەڵام بە گوێی نەكرد.

لە شەوی دووەمدا هەمان پیاوی لە خەویدا بینیو پێی وت: بچۆ بۆ فلانە جێگەو (١٠) دینار وەربگرە... كوڕەكەش وتی: ئایا خێروبەرەكەتی تێدایە؟ پیاوەكە وتی نەخێر... بۆ بەیانی بە هەمان شێوە بۆ هاوسەرەكەی گێرایەوەو ئەویش هەمان قسەی پێشووی كردەوەو بە گوێی نەكرد...

بۆ شەوی سێیەم دیسانەوە پیاوەكەی بینیەوەو پێی وت: بچۆ بۆ فلانە جێگەو یەك دینار وەربگرە... كوڕەكە وتی: خێرو بەرەكەتی تێدایە؟ پیاوەكە وتی: بەڵێ... كوڕەكە ڕۆیشتو دینارەكەی وەرگرت، پاشان چوو بۆ بازاڕو پیاوێكی بینی دوو ماسی پێ بوو... بە ماسی فرۆشەكەی وت: هەردوكیان بە چەند؟ وتی: بە دینارێك.

هەر دوو ماسیەكەی لێ كڕیو بەرەو ماڵ ڕۆیشتەوە... كاتێك سكی ماسییەكانی هەڵدڕی لە هەر یەكێكیاندا گەوهەرێك هەبوو، هەرگیز هاوشێوەی نەبینرابوو... پادشای وڵات لەو كاتەدا بەدوای گەوهەرێكدا دەگەڕا تا بیكڕێت... زۆر گەڕان گەوهەری واجوان تەنها لای ئەو كوڕە هەبوو كە خزمەتی باوكی كردبوو... گەوهەرێكیانی پێ فرۆشت بە (٣٠٠٠٠) سی هەزار دیناری زێڕ، كاتێك پاشا گەوهەرەكەی بینی زۆر لە لای جوان بوو، پاشا وتی: ئەم گەوهەرە لەگەڵ خوشكەكەیدا جوانەو دوو ئەوەندە پارەی پێ بدەنو پەیدای بكەن... كوڕەكەیان هێناو پێیان وت: ئایا خوشكی ئەم گەوهەرەت لە لایە؟ چەندمان داوە پێت، دوو ئەوەندەت دەدەینێ!!

كوڕەكە وتی: بەڵێ لە لامە، گەوهەری دووەمی پێدان بە نرخی دوو ئەوەندەی گەوهەری یەكەم..

خوشكو برای ئازیز سەیركە ئەم كوڕە گەنجە هەژارو نەدارە كە خاوەنی قوتی ڕۆژانەی نەبوو، خوای گەورە سەروەتو سامانێكی زۆری پێ بەخشی، ئەمەش بەهۆی ئەو چاكەیەوە بوو كە لەگەڵ باوكیدا ئەنجامیدا، كاتێ كە نەخۆش بوو و پێویستی بە یارمەتیدانی ئەو هەبوو...

چاكە كردن لەگەڵ دایكو باوكدا خێروخۆشییە لە دنیاداو پاداشتی گەورەیە لە ڕۆژی دواییدا...

هەستی حەوتەم

# پەیوەندیت چۆنە لەگەڵ تەلەفزیۆندا؟

نەسیم سەمادی
سەرنووسەری (خلاصات - المختار - علاقات)



لەوانەیە ئەم پرسیارەتان بەلاوە سەیر بێت؟ بەڵام هەندێك هەن پەیوەندییان بە تەلەفزیۆنەوە پتەوترە زیاتر لە پەیوەندییان بە منداڵەکانیانەوە، هاوکات بێگومان ئەوکەسانە پەیوەندییان بە تەلەفزیۆنەوە زۆر بەهێزترە لە پەیوەندی بەستنیان لەگەڵ خەڵکانی دەوروبەردا!

ئەمڕۆ تەلەفزیۆن بۆتە دوژمنی مرۆڤو دوژمنی پێشکەوتن، بەپێی ئەو وتە بەناوبانگەی کە دەڵێت: (پێم بڵێ لەگەڵ کێدا هەڵسوکەوت دەکەیتو تێکەڵاوی کێ دەکەیت؟ پێت دەڵێم تۆ کێیت) دەتوانین بڵێین: پێم بڵێ: ئەو بەرنامانە چین کە تەماشایان دەکەیت؟ پێت دەڵێم: تۆ کێیت).

لە هەموو بەڵایەك گەورەتر ئەوەیە کە زۆربەی کەناڵە ئاسمانییەکان شایانی تەماشا کردن نین، تەنها ژمارەیەکی کەمیان نەبێت کە خاوەنی ئامانجێکەو تا ئەندازەیەك گوزارش لە هۆشیاری دەکات، هاوڕێ بەو بەرنامانەی کە ئەرکی سەرکەوتنو گەشەپێدانو هاندانو فێرکردنیان گرتۆتە ئەستۆو شایانی ڕێز لێنانن، وێڕای لاوازیو چونیەکی بابەتەکانیان.

لەوانەیە هەندێك بڵێت: تەماشاکردنی هەواڵە ڕامیاریو ئابووریو ناوخۆییو هەواڵە جیهانییەکان کارێکی پێویستە، ئەم بۆچوونە ڕاستە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناکۆکین لە گەڵیدا، چونکە ٨٠ هەواڵەکان نێگەتیڤن، مرۆڤی هۆشیاریش درك بەوە دەکات کە پێویستە هەموو بەیانییەك بە دڵخۆشیو شادمانیو بەوپەڕی چالاکییەوە دەست بە ژیانی نوێی بکات، بەڵام گوێگرتن لەو هەواڵانە بەیانیان مرۆڤ تووشی بێ هیوایی دەکات، تەماشا کردنیشی لە ئێوارانددا دەبێتە مایەی نیگەرانیو دوودڵیو خەو زڕاندنی شەو، وێڕای ئەوەی کە بەرنامەکانی شەو کۆتاییان پێ نایەو دەبنە مایەی دواکەوتنی کاتەکانی خەوو نووستن، دواتریش کاتەکانی دەرچوونو گەیشتنە سەر کار.

ئەگەر تۆ لە بنیاتنەرانو کاریگەرانی سەر هەواڵ نیت، بۆچی تەماشای هەواڵەکانی بەیانیو ئێوارەو نیوەڕۆ دەکەیت؟

ئایا ڕۆشنبیریت زیاد دەکات؟ ئایا ئەو هەواڵانە دەتخەنە سەر ڕێگەی ڕاستو وات لێ دەکەن بگۆڕێیت بۆ کەسێکی پۆزەتیڤو کاریگەر؟ بێگومان هەمیشە وەڵام: نەخێرە! هەواڵەکان هەمیشە بە گرفت دەست پێدەکەنو بە گرفت کۆتاییان پێ دێت!

ئەمە جگە لەو بەرنامانەی بێ کەڵكو بێ ماناو' فلیمە پوچانەو ئەو پێشبڕکێو بەرنامانەی کە بۆ قۆڵبڕینو کڵاو لەسەر نانی کەم ژیرو رووخاوەکان دانراون!

ئەگەر هەواداری هزریو چالاکیو ڕۆشنبیریت هەیە، تەماشای بەرنامە ئامانجدارەکان بکەو هەاڵەکان لەرۆژنامەیەکی باوەڕ پێکراوەوە بخوێنەرەوە، خۆ ئەگەر تەماشا کردنی تەلەفزیۆن بۆ زیادکردنی بەرهەمی خۆتو گەشەپێدانی تواناکانت نەبێت، سوودی چییە؟

پەیوەندی خۆت بگۆڕە لەگەڵ تەلەفزیۆنداو ئاراستەی بکە پێش ئەوەی ئاراستەت بکات، بەڕێوەی بەرە، پێش ئەوەی ئەو تۆ بەڕێوەبەرێت!

وەکو کەناڵێكو ئامرازێك دایبنێ، نەك بۆ بەسەربردنی کاتو سەرگەرمی.

بەرنامەیەکی ئامانجدار هەڵبژێرەو لە پشووی کۆتایی هەفتەدا تەماشای بکە.

فیلمی دیکۆمێنتی، پێشبڕکێی وەرزش، درامای سوود بەخش هەیە هەر چەندە زۆر کەمن! لەگەڵ ئەوەشدا وەبەرهێنانی کاتەکانت لە تەماشاکردنیاندا بە سوودە هەندێ جار، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر کەمنو دۆزینەوەیان زەحمەتە، کتێبی ڕەسەن سەرچاوەیەکی زانستیو ڕۆشنبیریو مەعریفی زۆر لەو باشترە. هاوکات ئەگەر قەناعەتت کردووە بە زەرووڕەتی دووبارە چاوخشاندنەوە بە پەیوەندی نێوان تۆو تەلەفزیۆن یا نا؟

کەمترین داوای ئێمە ئەوەیە کە لە دوای کاتژمێر (10)ی شەو بەدواوە تەماشای تەلەفزیۆن نەکەیت، تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە لە تەلەفزیۆن کاردەکەیتو پیشەت دروستکردنی گرفتە بۆ خەڵکی یاخود هیچ نەبێت بڵاو کردنەوەیەتی!!

زیادەڕەوی کردن لە تەماشای تەلەفزیۆندا کارێکی نێگەتیڤە، تەماشاکردنیشی تا نیوە شەو کارێکی وێرانکەرە، چونکە کاتژمێرەکانی نووستن کەم دەکاتەوە، خەویش گرنگترین سەرچاوەی وزەی لاشەو دەروونەو یەکێکە لە نهێنییەکانی سەعادەت یا ماڵوێرانی مرۆڤ!

هیوای تەماشاکردنێکی ئامانجدارو خەوێکی ئارامت بۆ دەخوازین.